

# گۆڤاری کۆمپیوتەر

ژمارە ٧

(کانونی یەکەم) ی ٢٠٠٥

گۆڤارێکی مانگانەی تایبەتە بەبواری کۆمپیوتەرو ئینتەرنێت - وەزارەتی رۆشنبیری دەری دەکات

www. ... .com




- بەستنەوەی تەلەفزیۆن بەئامێری کۆمپیوتەر .
- گۆڕینی دەنگ بۆ شێوەی شەپۆلی رادیۆ .





- بەرنامەیەک ئاگادارت دەکاتەوە لە تێکچوونی کۆمپیوتەر .
- ماڵپەڕێک بۆ نمایشکردنی زیاتر لە هەزار کەناڵی ئاسمانی .
- قوتابخانەیەک بۆ پەروەردەکردنی هاکەرز لە فەرەنسا



پاشکۆی گۆڤار : سی دی تایبەت بە گۆڤارەکە

هەولێر - ٢٠٠٥

گۆڤاری

# کۆمپیوتەر

ژمارە ( 7 )
کانوونی یەکەم
2005

گۆڤارێکی مانگانەی تایبەتە بە بواری کۆمپیوتەر و ئەنتەرنێت . وەزارەتی ڕۆشنبیری دەری دەکات


## تێبینی : هەموو پەیوەندیەکان لە ڕێگای سەرنووسەرەوە دەبێت


ناونیشان:
هەرێمی کوردستانی عێراق / هەولێر . دیوانی وەزارەتی ڕۆشنبیری . شەقامی شەست مەتری نزیک هۆڵی زەرد
بۆ هەر پێشنیار و تێبینی و سەرنجێك یان ناردنی بابەتێك . پەیوەندی بکەن بە سەرنووسەرەوە
بەم ناونیشانە : دیوانی وەزارەتی ڕۆشنبیری . بەڕێوەبەرایەتی کۆمپیوتەر . یان بە ژمارە تەلەفۆنی
2232721 مۆبایل 07504618045 یان پۆستی ئەلکترۆنی





Email : computer_magazine_2005@yahoo.com

Email : aras_co_center@yahoo.com






### ئاگاداری

بۆ هەموو ئەو بەڕێزانەی کە بابەت ئەنێرن بۆبڵاو کردنەوە لە گۆڤارەکەمان با بە تەواوی ئاماژە بکەن بە ناونیشان و سەرچاوەی ئەو بابەتەی کە دەینێرن بە پێچەوانەوە ئێمە بەرپرسیار نین لە هیچ لێپرسینەوەیەك.









ACDSee 6.0
DELUXE
Fotos




Welc
DVD
MovieFactory




## بەڕێز سامی شۆڕش

# ئێمەی کورد پێویستیمان بەزۆر شت هەیە گرینگترینی ئەو شتانە بەکارهێنانی کۆمپیوتەرو ئەنتەرنێتە

دیمانە: ڕێناز حەوێزی

**بەمەبەستی تێڕوانینی بەڕێز وەزیری ڕۆشنبیری لەچەکی سەردەم و ڕادەی پێویستی لە کۆمەڵگای کوردیدا و پەیڤ و سەرنجی بۆ گۆڤاری کۆمپیوتەر لەوەڵامی چەند پرسیارێکدا ووتی:**



*** بەڕێز جەنابی وەزیری ڕۆشنبیری گومان لەوەدانیە کەلەو سەردەمەی پێشکەوتن و ئامێری پێشکەوتووی کارەکانی ڕۆژانە بەهۆیی پشت بەستن بەم ئامێرە پێشکەوتوانە دەبێت بەتایبەتی کۆمپیوتەر و ئەنتەرنێت تێڕوانینی بەڕێزتان لەم ڕوانگەیەوە چۆنە؟ یاخود هەبونی ئامێری پێشکەوتوو لەدام و دەزگاکانی حکومەتی هەرێمی کوردستان تاچەند بەپێویست دەزانیت؟**

- گەورەترین دەستکەوتی زانستی مرۆڤ لەم سەردەمەدا کۆمپیوتەرو ئەنتەرنێتە،بەهۆی ئەم دوو ئامێرە پێشکەوتووە جیهان زۆر بچووک بۆتەوە پەیوەندیەکان زۆر گەشەیان کردوە گواستنەوەی زانیاری و زانست و تاقی کردنەوەکان بەهۆی ئەم دوو ئامێرە زۆر ئاسان بووە بۆتە هۆی ئەوەی کە کۆمەڵگای مرۆڤ هەنگاوی زۆر خێراو گەورە بهاون بۆبەرەو پێش چوون، چونکە کۆمپیوتەر زمانی سەردەمە ئەنتەرنێتیش ڕۆشنبیری سەردەمە . لەم دیدەوە من پێم وایە میللەتی کورد و کۆمەڵگای کوردی زۆر پێویستیان بەوەیە گەشە بە بەکارهێنانی ئەم دوو ئامێرە بدەن، بیکەن بەکەناڵێکی زانستی زۆر گرنگ بۆ بەڕێوەبردنی ئیش و کارەکانی دام و دەزگاکانی حکومەتی هەرێمی کوردستان لەهەموو مەیدان و بوارێک گرنگی پێ بدەن ئێمەش میللەتێکین نزیکەی دە ساڵێکە ئازادیمان بەدەست هێناوە، ئەگەر بمانەوێ ئەم ئازادیە لەسەر بنەمایەکی ڕێک و پێک دابمەزرێ مانایی ئەوەیە ئێمەی کورد پێویستیمان بەزۆر شت هەیە گرنگترینی ئەو شتانە بەکار هێنانی کۆمپیوتەر و ئەنتەرنێتە .

*** لەوەزارەتێکی وەک وەزارەتی ڕۆشنبیری تاچەند هەبونی تۆڕی ئەنتەرنێت بەپێویست دەزانی ؟**

- بێگومان تۆڕی ئەنتەرنێت زۆر پێویستە بۆهات و چۆی زانست و زانیاری و پەیوەندی کردن بەجیهان، بەلام لەکوردستان هێڵی تەلەفۆن تائێستا بەشێوەیەکی ڕێک و پێک دانەمەزراوەتەوە ئەویش سەبارەت بەو سزا نێو دەوڵەتیانەی کەبەسەر عێراق و ئینجا بەسەر کوردستانیش داسەپا بوو لەسەردەمی ڕژێمی پێشوو . ئێستا حکومەتی هەرێمی کوردستان بەگەرمی خەریکی چاک کردنەوەی ئەو تۆرە یەو فراوان کردنی مەودای ئەو تۆڕەیە ئەنتەرنێتیش کەناڵە سەرەکیەکەی هێڵی تەلەفۆنە بۆیە ئەگەر هێڵی تەلەفۆنی ڕێک و پێک لەناو ولاتێک دا نەبێت زەحمەت ئەنتەرنێت گەشە تێدا بکات .بەلام لەگەڵ ئەو زەحمەتیانەش لەگەڵ ئەو ماندو بون و هیلاکیەی خەلک دەیکێشی لەگەڵ ئەوەش هەم لەوەزارەتی ڕۆشنبیری هەم لەوەزارەتەکانی تر هەر هەموومان خەریکی ئەوەین کەپشت بەستنی گەورە و سەرەکیمان بۆ کارەکان لەسەر ئەنتەرنێت بێت .

*** بەڕێزت وەک خاوەن ئیمتیازی گۆڤاری کۆمپیوتەر پەیڤێکی بچوکت سەبارەت بەگۆڤارەکە؟**

دەست خۆشی لە کارمەندانی گۆڤاری کۆمپیوتەر دەکەم چونکە بەڕاستی کارێکی زۆر باش دەکەن ڕاژەی بلاو بونەوەی ئەو گۆڤارە لەناو خەلک بەلگەی ئەوەیە کەگۆڤارەکە تاچەند لەڕویی ناوەڕۆکەوە پێش کەوتوە، تاچ ڕادەیەک خەلک تینوی زانستی کۆمپیوتەرن .بۆیە ئەم گۆڤارە جێگایەکی زۆری لەبۆشای لاوان و قوتابیان پڕکردۆتەوە هیوادارم بتوانن زۆرتر گەشەی پێ بدەن لەڕوی فۆرم و شێوەو لەڕویی چاپەوە جوانترو ڕێک و پێک تری بکەین.لەگەل ئەوەش گۆڤاری کومپیوتەر یەکێکە لەگۆڤارە پێشکەووتوەکانی کوردستان .

*** ئایا بۆساڵی نوێ پرۆژەی نوێتان لەبەردەست داهەیە بۆگۆڤارەکەمان ؟ یاخود لەبەر داواکاری زۆری خوێنەران بەنیاز نین تیراژی زیاد بکەن؟**

- بێگومان هەم تیراژی دەبێ زیاد بکرێ هەم لەڕویی فۆرم و شێوەشەوە جوانتر بکرێ بەڵێ بەدەستمانەوەیە تیراژی زیاد بکەین ئەگەر کرا هێشتا بەپەلە تری بخەین،بەلام کادیر لەمەیدانی نوسین لەبواری کۆمپیوتەر تاکو ئێستا کەمە بەوە وەستاوین مانگی جارێک دەری بکەین لەدوارۆژ ئەگەر کرا کادیر زۆر بوو خەلکی شارەزا لەمەیدانی نوسینی کۆمپیوتەر وە زیادی کرد ئەوە نەک هەر تیراژەکەی زیاد دەکەین بەلکو دەرچوونەکەش بەپەلە دەکەین .

*** پەیامی کۆتایت بۆگۆڤارەکەو خوێنەرانی گۆڤاری کۆمپیوتەر؟**

- پەیامی کۆتایم هەر ئەوەیە کەسەرکەوتن بۆگۆڤارەکە دەخوازم هیوام وایە کارمەندانی بە وپەڕی تاقەت و توانایی خۆیانەوە هەوڵبدەن گۆڤارەکە پێش بخەن بەبەر هەمی خۆیانی بزانن، دەست خۆشیان لێ دەکەم وە ئەوەش دەڵێم کە بلاوبونەوەی ئەم گۆڤارە پڕکردنەوەی بۆشاییەکی گەورەبوو لەمەودایی کتێبخانەی کوردی . ئەوبلاو بونەوە زۆرە نیشانەی ئەوەیە کەکۆمەڵگای کورد بەڕاستی تینوی فێربوونی زانست و خۆگونجاندنە لەگەل ڕوحی سەردەمی ئەمرۆ.

# پەیامێکی پرۆژە ئامێز



**سەرنووسەر**

پێم خۆشە پێش ئەوەی باسی پەیامەکەم بکەم پیرۆزبایەکی زۆر گەرم ئاراستەی هەموو گەلی کورد بە گشتی و خوێنەرانی ئەم گۆڤارەش بە تایبەتی بکەم بە بۆنەی هاتنی ساڵێکی تازە و جەژنی قوربانی پیرۆز و هیوای ژیانێکی پڕ خۆشی و بەختەوەریان بۆ دەخوازم هیوادارم هەردەم ئەم گەلە بەڕێزە ناخۆشی نەبینێت و دەرگا داخراوەکان بە روویاندا بکرێتەوە هەردەم بە زانست ڕێگاکانیان ڕووناک بکرێتەوە .

ئەم پرۆژەیە بۆ نووسەران و بۆ ئەو کەسانەی کە لە دەرەوەی وڵات ژیان بەسەر دەبەن و بە دوای نووسین و کتێبی کوردی دا دەگەڕێن و بۆ نەوەکانی دوای خۆمان و بۆ دەوڵەمەند کردنی کتێبخانەی کوردەواری سوودێکی یەکجار زۆری هەیە بۆیە تکایە رەچاوی بکەن .

بەڕێزان ئەم پەیامە هەموو تاکێکی کورد دەگرێتەوە و بە تایبەتی هەموو نووسەران کە لە بوارەکانی ئەدەبی و ڕۆشنبیری و زانستی و هەموو بوارەکانی تری نووسیندا کار دەکەن ئەوان کاتێک کە نامیلکەیەک یان کتێبێک دەنووسن ئەوە بێگومان دەبێ ئەو کتێبە یان ئەو نامیلکەیە بە ئامێری کۆمپیوتەر بنووسنەوە و کاتێک کە تەواو دەبن لە نووسینەوەی کتێبەکەش ئەوا بۆیان دەخرێتە سەر دیسک یان سیدی یان فلاش میمۆری بۆ ئەوەی خەزن بکرێت لە لای خاوەنی نووسینەکە ئنجا نووسەر بۆ بڵاو کردنەوەی بابەتەکەی دەبێت ژمارەی سپاردن بۆ کتێبەکەی وەربگرێت تا بتوانێت بە چاپی بگەینێت لە چاپخانە ئنجا مەبەستەکەی من لێرەدا ئەوەیە، ئەو بەڕێزە ئەگەر بیەوێ کتێبەکەی بە شێوەیەکی ئەلکترۆنی لە سایتەکانی ئەنتەرنێتدا بخرێتە ڕوو ئەوا دەبێت ئەو سیدی یان ئەو دیسکەی کە کتێبەکەی بە شێوەی ( داتا ) لە ناودا خەزن کراوە لەگەڵ دەستنووسی کتێبەکە بیبات بۆ ئەو جێگایەی کە ژمارەی سپاردنی پێ دەدەن کە ئێستا ژمارەی سپاردن لە (کتێبخانەی گشتی) یە بۆ ئەوەی هەر لەگەڵ بڵاو بوونەوەی کتێبەکە لە بازاڕدا ئەوا لە ناو سایتەکانی ئەنتەرنێتیش بە هەمان شێوە کتێبەکە بڵاوبێتەوە ئنجا ئەو هەنگاوە بەراستی هەنگاوێکی پیرۆزە بۆ هەموو گەلی کورد و دەست کەوتێکی گەورەیە و بۆمان دەمینێتەوە بۆ مێژوو تا نەوەکانمان دوای خۆمان هەست بەو ئەرکە

بکەن کە ئێمە کێشــاومانە شــایانە باسە ئەم هەنگاوە بەڕێــز وەزیــری ڕۆشــنبیری و بەڕێوبەری گشــتی دیوانی وەزارەت و بەندە پێشنیارمان کردوە و بەرێز بەریوبــەری کتێبخانــەی گشــتی هــاوکاری تەواوی کردووین هەموو ئاســانکاریکی لــەو بارەیەوە بۆمان کردووە و ئێســتا ئێمە وەکوو وەزارەتی ڕۆشــنبیری ئەو پرۆژەیەمان بە دەســتەوەیە بۆ درووست کردنی کتێبخانەی کوردی بە شێوەیەکی ئەلکترۆنی کە هەموو ناونیشانەکانی کتێبە ئەلکترۆنیەکانمان بە هۆی داتایەک بخەینە نــاو ئامێری کۆمپیوتەر و دواتریش لە ڕێگای ســایتێکی ئەنتەرنێتەوە ئەو کتێبانە بۆ هەموو جیهان بڵاو دەکەینەوە تا هاوڵاتیانی کورد لە هەر جێگایەکی سەر ئەم زەمینە بتوانن سوود لەو کتێبانە ببینن، بۆیە دیســان داوای یارمەتی لە هەموو نووســەران دەکەم لــە ڕێگای ئەم گۆڤارەوە کە هەوڵ بدەن لەگەڵ بردنی دەســت نووسەکانیان بۆ وەرگرتنی ژمارەی سپاردن ئــەوا ســیدیەکی ( داتا) لەگــەڵ خۆیان ببن تاکوو کارەکە بۆ ئێمە و بۆ خۆیان ئاسان بکەن و هیوادارم ئــەم پرۆژەیــە بکرێتە مەرجێک لە کتێبخانەی گشــتی بۆ ئەو کەســانەی کە ئەیانەوێت ژمارەی ســپاردنیان پــێ بدرێت بۆ ئەوەی ئێمە بتوانین کارەکانمان وەکوو پیویســت ئەنجــام بدەین بــۆ ســەرکەوتنی پرۆژەی دامەزراندنی کتێبخانەی کوردی ئەلکترۆنی .






# گۆڕینی دەنگ بەشێوەی رادیۆ لەبەرنامەی کول ئیدت پرۆ Cool Edit Pro

ئا کاوە سلێمان

بەڕێزان بەرنامەی COOL EDIT PRO مان باسکردوە بەزنجیرە بێگومان توانای هێندە بەرزە کەبەهەر شێوەیەک باسی بکەیت ناتوانیت ئەو هەموو کارە چاکەی باس بکەیت کە پێشکەش بە مرۆڤ دەکات لەدنیای دەنگ چونکە توانایەکی ئەو تۆی هەیە کە مرۆڤ بروا ناکات چۆن ئەوبەرنامەیە دەتوانێت هەموو ئەو گۆرانکاریانە بەسەر دەنگ بهێنێت بەلی بەرنامەی COOL EDIT PRO لەتوانای داهەیە هەموو ئەو گۆرانکاریەک بەسەر دەنگ بهێنێت بەڕێزان لەم زنجیرەیەشدا باس لەوە دەکەین کە گۆرینی دەنگ بەشێوەی رادیۆ واتا ئێستا مۆدێلە کەزۆربەی گۆرانیەکانی بیانی و عەرەبی و تورکی و فارسی وەهەروەها بەم دواییەش ئێمەی کوردیش ئەو هەلەمان قۆس تەوە سودمان لەو ئیفێکتە وەر گرت بۆنمونە گوێبدە گۆرانی زەکەریا عبداللە گۆرانی ڤۆن وانابێت سەرەتاکەی بەشێوەی رادیو دەست پێدەکات.

## چۆنیەتی کارکردن

سەرەتا ئەودەنگەی پێویستمانە دێنینە ناو بەرنامەکە لەرێگا OPEN دوە ئینجا ئەو شوێنەی پێویستمانە دیاری دەکەین بەماوس ئینجا دێینەسەر EFFECTS لەوێوە دێنە سەر FILTERS لەوێوە دێینە سەر FFT FILTERS کلیک دەکەین لیستێک دێتە بەرچاو ئینجا لەلیستەکەدا ON HOLD 400K هەڵدەبژێرین ئینجا OK دەکەین دەبیستین کەدەنگەکە بەشێوەی رادیۆ دەبیستین (وێنە ١).

# وێنە گرتن لەبەرنامەی Vcd Cutter

وێنەی (١)

## ئا: دێدەوان نەورۆز

بێگومان زۆرجار ئێمە پێویستمان بەوێنەیەک دەبێت بۆنمونە ئەگەر سیدییەکمان هەبێت ئەو سیدییە فیلم بێت یاخود کلیپ بێت چۆن دەتوانین وێنەیەک لەو سیدییە دەر بێنین بێگومان لەرێگای بەرنامەی VCD CUTTER وە دەتوانین ئەوکارە ئەنجام بدەین بەرنامەی VCD CUTTER دەکەینەوە ئەو پارچە ڤیدیۆیەی کە وێنەکەمان پێویستە لێی دەربهێنین دێنینە ناو بەرنامەی VCD CUTTER لەرێگای فایل لەوێوە ئۆپن بەم شێوەیە (وێنە ١) پاشان ڤیدیۆکە دێنینە ئەوشوێنەی کە وێنەکەمان پێویستە ئینجا لەخوارەوە وێنەی کامیرایەک بە بچووکی دیارە هەر کاتێ کلیک لەسەر ئەو کامیرایە بکەین وێنەیەک دەچێتە ناو بەرنامەی VCD CUTTER بە شێوەیە (وێنە٢).




وێنەی (٢)

# دروست کردنی حاسیبە لە ڤیژوەل بەیسک

ئا: ئیبراهیم نادر

سەرەتایەک دەربارەی پێکهاتەکانی ڤیژوەل بەیسک:-

وەک دەزانین (VISUAL BASIC) بە یەکێک لە زمانە گرینگەکانی کۆمپیوتەر دادەنرێت بۆ دیزاین کردنی پرۆژە و دانانی بەرنامەی کارپێ کردن کە لە ژیانی رۆژانەمان بەشێوەکی بەرچاو لە فەرمانگە و دام ودەزگاکان دەبینرێت.

پێکهاتەکانی (VISUAL BASIC) ئەم بەشانەی خوارەوە دەگرێتەوە.

١. TITLE BAR شاشە دەردەکەوێت ناوی پرۆژە و وە حاڵەتی پرۆژەکە دیاری دەکات کە ئاخۆ پرۆژەکە لە قۆناغی (DESIGN) وە یان لە قۆناغی (RUN) دایە.

Project1 - Microsoft Visual Basic [design]

٢.MENUS BAR ئەو شریتە دەکەوێتە ژێر TITLE BAR وەک لەم وێنەیەی خوارەوە دەبینین کۆمەڵێک لیست دەگرێتەخۆ وە هەر لیستێک کۆمەڵێک فرمان دەکرێتەوە وە هەرفرمانێکیش کارێکی دیاریکراو دەکات.

File Edit View Project Format Debug Run Query Diagram Tools Add-Ins Window Help

٣. TOOL BAR

ئەم شریتەش کۆمەڵێک هێماو شێوە لە خۆدەگرێتەوە کە نوێنەرایەتی هەندێک لە فرمانەکان دەکەن کە لە لیستەکانی MENUS BAR



٤.TOOL BOX ئەو شریتەیە کە دەکەوێتە لای چەپی شاشە (GENERAL) ئەم پێکهاتانەی خوارەوە دەگرێتەوە (CONTROL، OBJECT، COMPONET ....هتد) وە هەر یەک لە ناوانە ئاماژە دەکەن بۆ هەمان کاری پێکهاتەکانیان بۆ دروست کردنی نمونەیەک و نیشاندانی ئەمەشیان کۆمەڵێک تایبەتمەندی خۆیان هەیەلە رووی (EVENT) وە (METHODS)

٥.(PROPERTIES WINDOW) لە رێگای ئەو شاشەوە دەروانین تایبەتمەندیەکانی هەر پێکهاتەیەک دیاری بکەین کە ئەو نمونەیەی دەمانەوێت پێکی دەهێنێت.

٦. (PROJECT EXPLORER) ئەمەیان شاشەیەکە بە جۆرێک دەتوانین هەموو پێکهاتەکانی پرۆژە لەو شاشەیە ببینین بە شێوەیەک ئەگەر هەر پرۆژەیەک پێکهاتبێ لە کۆمەڵێک نموونە ئەوا دەتوانین بگەینە هەر نموونەیەک کە بمانەوێت.

٧. (FORM) پێکهاتەیەکی سەرەکیە کە هەموو پێکهاتەکانی تری پرۆژە لەخۆ دەگرێتەوە.

٨. (VISUAL BASIC EDITOR) ئەو شاشەیە کۆدە جیا جیایەکان تێدا دەنوسین، بێگومان هەر کۆدێکیش فرمانێکی دیاری کراو بۆ جێ بەجێ دەکات.وەک لەم وێنەیەی خوارەوە دەردەکەوێت.




بۆ دیزاین کردنی FORM و دروست کردنی پرۆژە پشت بەبەستە بەم خشتەیەی خوارەوە:-

وەک لەم وێنەیەی خوارەوە دەردەکەوێت ئێمە بۆ دروست کردنی حاسیبەیەک پێویستمان بە شانزدە (COMMAND) وە سێ (LABEL) وە (TIMER) ێک هەیە. (LABEL1) لە CAPTION نوسیومانە (بەخێر بێن) لە (TIMER1) دا ئەو کۆدەمان بۆ داناوە کە ئەم نوسراوە لە دەستەراست بچێت بۆ دەستە چەپ (LABEL3) لە CAPTION نوسیومانە (PROGRAMER ARAM) لە (TIMER) دا ئەو کۆدەمان بۆ داناوە کە دەستە چەپ بچێت بۆ دەستە راست وە (LABEL2) لە (CAPTION) ئەو نوسراوەی کە لەسەری نوسراوە (LABEL2) دەسرینەوە وە کۆدی دەرخستنی کات ژمێرمان بۆ داناوە . وە بۆ (COMMAND) کانیش لە CAPTION بەپێ ی فرمانی هەر (COMMAND) کە چ کۆدێکمان بۆ داناوە هێمایەکمان بۆ داناوە .



```
(COMMAND1 ==CAPTION== ( 0
(COMMAND2 ==CAPTION==( 1
(COMMAND3==CAPTION==( 2
(COMMAND4 ==CAPTION==( 3
(COMMAND5 ==CAPTION==( 4
(COMMAND6 ==CAPTION==( 5
(COMMAND7 ==CAPTION==( 6
(COMMAND8 ==CAPTION==( 7
(COMMAND9 ==CAPTION==( 8
(COMMAND10 ==CAPTION==( 9
( COMMAND11 ==CAPTION== (C
( =) ==COMMAND12 ==CAPTION
( +) ==COMMAND13 ==CAPTION
( - )==COMMAND14 ==CAPTION
( *) ==COMMAND15 ==CAPTION
( / )==COMMAND16 ==CAPTION
```

دانانی بەرنامە بۆ هەر پێکهاتەک بە پی ی ئەو فرمانانەی کە دەمانەوێ جێ ی بەجێ بکات:-

```
DIM OPERATION  AS INTEGER
DIM FIRATNO.  AS INTEGER
DIM SECONDNO. AS INTEGER
PRIVATE SUB COMMAND1_CLICK()
TEXT1.TEXT = TEXT1.TEXT + CHR(48 )
END SUB
PRIVATE SUB COMMAND10_CLICK ()
TEXT1.TEXT = TEXT1.TEXT + CHR(57)
END SUB
()PRIVATE SUB COMMAND11_CLICK
TEXT1.TEXT ""=
END SUB
PRIVATE SUB COMMAND12_CLICK()
IF OPERATION = 1 THEN
SECONDNO. TEXT1.TEXT =
TEXT1.TEXT "" =
.TEXT1.TEXT = FIRATNO. + SECONDNO
END IF
IF OPERATION = 2 THEN
SECONDNO. TEXT1.TEXT =
TEXT1.TEXT ""=
.TEXT1.TEXT = FIRATNO. - SECONDNO
END IF
IF OPERATION = 3 THEN
SECONDNO. TEXT1.TEXT =
TEXT1.TEXT ""=
.TEXT1.TEXT = FIRATNO. * SECONDNO
END IF
IF OPERATION = 4 THEN
SECONDNO. TEXT1.TEXT =
TEXT1.TEXT ""=
.TEXT1.TEXT = FIRATNO. / SECONDNO
END IF
END SUB
PRIVATE SUB COMMAND13_CLICK ()
FIRATNO. TEXT1.TEXT =
TEXT1.TEXT ""=
OPERATION = 1
END SUB
PRIVATE SUB COMMAND14_CLICK ()
FIRATNO.  TEXT1.TEXT =
TEXT1.TEXT ""=
OPERATION = 2
END SUB
PRIVATE SUB COMMAND15_CLICK()
FIRATNO.  TEXT1.TEXT =
TEXT1.TEXT =""
OPERATION = 3
END SUB
PRIVATE SUB COMMAND16_CLICK()
FIRATNO. TEXT1.TEXT =
TEXT1.TEXT= ""
OPERATION = 4
END SUB
()PRIVATE SUB COMMAND2_CLICK
TEXT1.TEXT = TEXT1.TEXT + CHR(49 )
END SUB
PRIVATE SUB COMMAND3_CLICK ()
TEXT1.TEXT = TEXT1.TEXT + CHR(50)
END SUB
PRIVATE SUB COMMAND4_CLICK ()
TEXT1.TEXT = TEXT1.TEXT + CHR(51)
END SUB
PRIVATE SUB COMMAND5_CLICK ()
TEXT1.TEXT = TEXT1.TEXT + CHR(52)
END SUB
PRIVATE SUB COMMAND6_CLICK()
(TEXT1.TEXT = TEXT1.TEXT + CHR(53
END SUB
()PRIVATE SUB COMMAND7_CLICK
(TEXT1.TEXT = TEXT1.TEXT + CHR(54
END SUB
PRIVATE SUB COMMAND8_CLICK()
TEXT1.TEXT = TEXT1.TEXT + CHR(55)
END SUB
()PRIVATE SUB COMMAND9_CLICK
TEXT1.TEXT = TEXT1.TEXT + CHR(56)
END SUB
()PRIVATE SUB LABEL2_CLICK
LABEL2.CAPTION = TIME
END SUB
PRIVATE SUB TIMER1_TIMER()
LABEL1.LEFT = LABEL1.LEFT + 50
IF LABEL1.LEFT > 5500 THEN
LABEL1.LEFT = 0
END IF
LABEL3.LEFT = LABEL3.LEFT - 80
IF LABEL1.LEFT <= 0 THEN
LABEL3.LEFT = 5000
END IF
END SUB
```

# پرۆگرامی (Sound Recorder)




وێنەی (١)

ئا: ژیلوان نامق

یەکێکە لە پرۆگرامە (ACCESSORIES) ییەکان کە لە گەڵ دابەزاندنی سیستەم دائەبەزێت خزمەتێکی باش پێشکەش ئەکات لە بواری دەنگدا، وەک:

تۆمار کردنی دەنگ بەهۆی (MIC)ەوە و دەنگ گرتنەوەی ناو ئامێرەکەت بۆ ماوەی یەک خولەک وە لە جۆری (WAVE)لە گەڵ پێدانی (صدى) و (عكس) کردنەوەی ئاراستەی دەنگ و خێراکردنی ............هتد .

بۆ چوونە سەر بەر نامەکە سەیری وێنەی یەک بکە:

دوای کردنەوەی فایلێکی دەنگی لە جۆری (WAVE) دەچینە سەر (SAVE AS) و پاشان (CHANGE) کلیک ئەکەین وەک وێنەی (٢) و پاشان لە گۆشەی (NAME) دا (RADIO QUALITY) هەڵدەبژێرین و (OK) دەکەین و لە کۆتاییدا (SSAVE)ی ئەکەین وەک وێنەی (٣) ...وە (CD QUALITY) قەبارەی ئاسایی فایلەکەیەو(TELEPHONE QUALITY) زۆر قەبارەکەی بچووک دەکاتەوە بەڵام دەنگی تێکدەچێ.

# بەرنامەی ACDSee V3.1




ئا: هاژە کامەران

بێگومان بەرنامەی ACDSEE V3.1 دیارە بە بەهێزترین بەرنامە دانراوە لەجیهان شێوەی نیشاندانی هاوشێوەی نی یە کەبە حەجمی وێنەکە بێ ئەوەی هیچ لەدیقەی وێنەکە کەم بکاتەوە هەموو شێوەکانی وێنە نیشان دەدات . هەروەها کارکردنێکی زۆر ئاسانی هەیە کەدەبێتە یارمەتیدەرێکی سەرەکی مرۆڤ و ئاسانکاریەکی زۆرمان بۆدەکات هەروەها وێنەکان بەشێوەیەکی گشتی پێنیشان دەدات لەناو هاردی کۆمپیوتەر ئەمەش دەبێتە ئاسانکارێکی تر بۆمان چالاکی ئەوبەرنامە دەبینین ئەگەر کاری پێبکەین سەیردەکەین زۆر شتمان بۆجێبەجێ دەکات کە پێویستمان بەچەند بەرنامەیەکی ترنابێت هەرئەو بەرنامەیە کاری چەند بەرنامەیەکی ترمان بۆدەکات قەبارەی ئەم بەرنامەیە ٥،٧ میگا بایتە سودەکانی بەرنامەی ACDSEE V3.1

١- نیشاندانی وێنەکان یەک بەدوای یەک بەریزبووی بەگوێرەی ژمارەکانیان لەهەر فایلێبێت.

٢- نیشاندانی وێنەکە بەشێوەیەک هیچ لەقەبارەی وێنەکە نەگۆرێت.

٣- گۆرینی جۆری فایلی وێنەکە بۆنمونە JPG بۆ BMP

٤- دانانی وێنەکە بۆ سەرشاشە وەک باگراوند

٥- هەروەها کۆپیکردنی وێنەکە وە دانانی وێنەکە لە فایلێکی تر

٦- نیشاندانی هەموو وێنەکان لەیەک کاتدا و یەک بەدوای یەک بەجۆری کلیپ.

٧- هەروەها رەشکردنەوەی وێنەکان و گۆرینی ناوی وێنەکان

٨- چاپکرنی وێنەکە هەر لەناو ئەم بەرنامەیە.




وێنەی (١)

# بەرنامەی Ulead DVD PictureShow SE

ئا: نیاز محسن

ئەوبەرنامەیە سوودی لێوەردەگیرێت بۆ ریزکردنی وێنەو هەروەها نیشاندانی بەشێوەی کلیپ کەدەتوانیت دەنگیش لەگەڵ وێنەکان دابنێیت بێگومان ئەوکارە زۆر پێویستە زۆرجـار ئێمە کۆمەڵە وێنەکمان هەیە دەمانەوێ لێکیان دەین بەشێوەی فلیم و هەروەها گۆرانیشی لەگەڵ بێت . سەرەتا دێین بەرنامەکە دەکەینەوە لەسەرەوە دوو هەڵبژێردراو هەیە یەکەمیان VCD 2.0 و ئەویتریان DVDیـە واتا دەتوانی راستەو خۆ پاش تـەواوبـوونـی کارەکانت کۆپی بکەیت بەشێوەی VCD و هەروەها بەشێوەی DVD ئێستا دێین یەکمیان هەڵدەبژێرین ئەویش بریتییە لـە VCD ئینجا NEXT دەکـەین لیستێکی تردێتە بـەرچاو بەم شێوەیە (وێنــە ١) ئینجا لەسەرەوەی ئەم لیستە ADD SLIDESHOW هەیە یەک جار بەماوس کلیکی لەسەردەکەین لیستێکی تردەبێتەوە ئەویش لیستی بەرنامەکەیە هاردەکان شیدەکاتەوە پێت دەڵێت کام وێنەت دەوێ دەست نیشانی بکە هەروەها لـەلای چـەپ لـەخـوارەوە دوو نوسراو هەیە زۆر گرنگن یەکەمیان SLIDESHOW TITLE ە و ئەویتریان BACKGROUND MUSIC ە ئەمەیان سودی لێوەردەگیرێت بۆ نووسین واتا هەر نووسینێک بکەیت لەسەر وێنەکان دیار دەبێت ئەمەش زۆر پێویستە ئەویتریان سودی لێوەردەگیرێت بۆ دانانی گۆرانی یاخود مۆسیقا لەگەڵ وێنەکان گوێبیست دەبین پاشان بەهۆی

ماوس ئەو وێنانەی پێویستمانە دیاری دەکەین پاشان ADD IMAGE لێدەدەین دەبینین ئەو وێنانەی دیاریمان کردوە دێتە ناو بەرنامەکە (وێنــە ۲) ئینجا لەخوارەوە DONE هەیە بەماوس کلیکێک لەسەری دەکەین پاشان NEXT لێدەدەین لیستێک دەکەوێتە بەرچاو بەم شێوەیە (وێنە ۳) لەسەرەوە لەرێگای PROJECT TEMRLATE دەتـوانـیـت بـاکـراونـدی وێنەکان بگۆریت پاشان دووبارە NEXT لێدەدەین دیسان لیستێکی تردێت دیسان NEXT لێدەدەین ئینجا لیستی کۆتایی دێت بەمەرجێک دەبێت ئامێری کۆمپوتەرەکەت رایتەری لەسەربێت ئینجا سیدی بەتاڵ دەخەینە سەر رایتەر و دووبارە NEXT دەکەین سەیردەکەین ئەوکارەی کردمان دەچێتە سەر سیدییەکە.



وێنەی (۲)



وێنەی (۳)





وێنەی (١)

ئا: فاخر محمود

وەک لەزنجیرەکانی پێشوو باسمان لەگرنگی بەرنامەی میدیا ستۆدیۆ کرد کە لەدونیای مۆنتاج هاوتای نیە چەند کارێکی زۆرگرنگ ئەنجامدەدات لە ڤیدیۆ وێنەدا کەدەبێتەیارمەتیدەرێکی سەرەکی لەئاسانکاری لەمۆنتاج هەر

لەم زنجیرەیەشدا باس لە دانانی VIDEOFILTER دەکەین بۆسەر ڤیدیۆ یاخود وێنە.

سەرەتا بەرنامەکە دکەینەوە ئینجا لەسەرەوە لەسەر رووبەری جولەکان TRANSITION EFFECT دەگۆرین بۆ VIDEOFILTER (وێنە ١) ئینجا یەکێک لە جولەکان رادەکێشین بۆسەر پارچە ڤیدیۆکە بەماس ئینجا OK دەکەیت دەبینیت کە جۆرەها گۆرانکاری بەسەر ڤیدیۆکەدێت هەریەکەو بەجۆرێک (وێنە٢)


وێنەی (١)

# بەرنامەی Paragon CD Emulator




وێنەی (١)




وێنەی (٢)

## ئا: دیار هەژار

ئەوبەرنامەیە سوودی لێ وەردەگیرێت بۆ ئەوەی بتوانی کۆمپیوتەر وەک ئامێرێکی کۆپی بەکۆمەڵ بەکاربهێنیت وە ئەو بەرنامەیە چەند رەقیبێکی هەیە کەهەموویان هەمان کاردەکەن بەڵام وەک ئەو بەرنامەیە سەرکەوتو نین ئەوانی تر زیان بەسیدییەکان دەهێنن بەڵام ئەم بەرنامەیە بەپێی تاقیکردنەوە سەرکەوتنێکی باشی بەدەست هێناوە

سەرەتا پاش دابەزاندنی لەسەر کۆمپیوتەر بەرنامەکە دەکەینەوە لەسەرەوە IMAGE دەکەینەوە لەوێوە GRETE CD IMAGE کلیک دەکەین ئینجا NEXT دەکەین بەم شێوەیە (وێنە١) پاشان سێ لیستی تر بەدوای یەک دێن هەر سێ لیست NEXT دەکەین ئینجا چاوەڕێدەکەیت تا تەواوبوونی کۆپییەکە (وێنە٢).

# Movie Maker



وێنەی (١)

ماکۆس کەرەم عەبدوڵا
makossexr@yahoo.com

### بەشی یەکەم

(MOVIE MAKER) یەکێکە لە بەرنامەکانی ویندۆس، ئەم بەرنامەیە بەکاردێت بۆ:-
* تۆمارکردنی دەنگ.
* تۆمارکردنی ڤیدیۆ ئەگەر (کامێرا) مان هەبێ.
* درووستکردنی وێنەی جولاو.

(MOVIE MAKER) چەندین جوانکاری تێدایە، بۆ جوانکرنی ئەو (وێنە) و (ڤیدیۆ)یانەی، کە ئیشیان لەسەر دەکەین، ئەم بەرنامەیە لە ویندۆزی (XP) و (ME) هەیە، بەڵام لە (XP) بە هێزترە ...

((چۆنیەتی چوونە بەرنامەکەوە))
لیستی START پاشان بۆ (PROGRAM FILES) ئینجا بۆ ACCESSORIES و هەڵبژاردنی (MOVIE MAKER).
بەشی یەکەم:- وێنەی (١)

**١- تۆمارکردنی دەنگ:**
سەرەتا (MOVIE MAKER) ئەکەینەوە پاشان ئەچینە سەر (NARRATE TIMELINE) کە لە خوارەوە هێمای (مایک)ی بۆ دانراوە. وەکو وێنەی (١)

**٢- تۆمارکردنی ڤیدیۆ:-**
لە لیستی ئایکونەکان، ئایکونی (TASKS) هەڵدەبژێرین چەند نووسراوێکمان دێتە پێش چاو، کە نووسراوە (MOVIE TASKS) لە خوارەوەشدا، چەند هەڵبژاردنێکی تر هەیە، کە لێرەدا




وێنەی ژمارە (٢)

پێویستمان بە (CAPTURE VIDEO) دەبێ بۆ تۆ مارکردنی ڤیدیۆ، پاشان هەڵبژاردنی (CAPTURE FROM VIDEO DEVICE)، ئینجا (NEXT) دادەگرین، ناوێکی بۆ دادەنێین و ئەو شوێنەی، کە دەمانەوێ ڤیدیۆکەی لێ هەڵگرین دەستنیشان کەین، (NEXT) ئینجا هەڵبژاردنی (START CAPTURE)، پاشان (FINISH) دادەگرین، وە دەتوانین لەگەڵ ڤیدیۆ کەدا دەنگیش تۆمار بکەین ئەگەر ویندۆزمیدیا پلەیەر لە کاردابێ. وەکو وێنەی(١)

**٣- درووست کردنی وێنەی جوڵاو:-**

ئەمەیان گرنگترین بەشی (MOVIE MAKER)ە سەرەتا بۆ دانانی وێنە ئەم هەنگاوانە جێ بەجێ دەکەین..

* دەچینە سەر (CAPTURE VIDEO) پاشان ((IMPORT PICTURES ئەو وێنەیەی دەمانەوێ هەڵی دەبژێرین.

* دەچینە سەر وێنەکە و کلیکی ڕاستی لەسەر دەکەین،(ADD TO TIMELINE) هەڵدەبژێرین، یا (CTRL+D) دەکەین، بڕۆ بۆ وێنەی (٢).

*** دانانی وێنەی جوڵاو:-**

سەرەتا ئەچینە سەر بەشی یەکەم و هەڵبژاردنی (IMPORT VIDEO) و(ADD) ئادکردنی بۆ خوارەوە .

*** دانانی فایلی (دەنگی):**

دەچینە بەشی یەکەم بە هەڵبژاردنی (IMPORT AUDIO OR MUSIC) دەتوانین ئەو گۆرانییە، یا ئەو پارچە مۆسیقایەی دەمانەوێ دایبەزێنین ئەویش بە هەمان ڕێگای پێشوو کلیکی ڕاست و(ADD) ئادکردنی بۆ خوارەوە.

## بەشی دووەم:

**دانانی جوانکارییەکان:-**

لە بەشی دووەمی MOVIE TASKS کە (EDIT MOVIE)ە چەند هەڵبژاردنێکمان دێتە بەرچاو:-

١- SHOW COLLECTIONS:- بۆ دیارخستنی وەرگرتەکان واتە ئەو (وێنە، ڤیدیۆ، دەنگ)انەی کە پێشتر کردوومانەتەوە.

٢- VIEW VIDEO EFFECTS:- ئەم بەشەیان چەندین کاریگەری (EFFECT) تێدایە، کە ئەو وێنەیە، یا ئەو ڤیدیۆیەی هێناومانە، دەیانگۆرێت، بە چەندین شێوەی جوان، بۆ نموونە: (EASE IN) بەکاردێت بۆ نزیکخستنەوەی وێنە کە ئەمەش شێوەیەکی زۆر جوان ئەداتە

بەرهەمەکە، هەروەها ئەتوانین وا لە ڤیدیۆ یا وێنە بکەین کە کۆن دیار بێ، یان بەچەندین جۆر ڕەنگ بە دیارکەوێ، یان وەکو وەرزی پایزی لێبێ، یاخود گۆڕینی وێنەی ڕەنگاو ڕەنگ بۆ ڕەش و سپی، چەندین شێوەی تر، لە وێنەی (١) ئاماژەی پێ کراوە.

٣- VIEW VIDEO TRANSITIONS:- پێی دەوترێت قۆناغی گواستنەوە، واتە دەتوانین لێرەدا بە ئارەزووی خۆمان جوولە بدەینە وێنە و پارچە ڤیدیۆییەکان بەچەندین شێوە، لەوانە دەتوانین وا لە وێنە بکەین بەشێوەی پەڕ هەڵبدرێتەوە، یان بە شێوەی دڵ وێنەی پاش خۆی پیشان بدات، هەر بەم شێوەیە دەتوانین وێنەکانی خۆمان بە ساناترین شێوە هەڵبگرین، لەگەڵ دانانی میوزیک و گۆرانی و چەندین کاریگەری(SFFECT)ی بۆ دابنێین لە هەمان کاتدا دەتوانین دەنگی خۆشمانی لەگەڵ دانێین، جگە لەوە دەتوانین وا لە وێنە بکەین کە لەگەڵ وێنەیەکی تر بەکاڵی دیار کەوێ واتە تێکەڵکردنی دوو وێنە ئەمەش بەکلیککردنی چەپ لەسەر وێنەکە و ڕاکێشانی بۆ سەر وێنەکەی تر، سەیری وێنەی (١) بکە.



وێنەی ژمارە (٣)

٤- MAKE TITLES OR CREDITS:- هەر نووسینێک یان شیعر کە مەبەستمانە بینووسین لەم بەشەیان ئەتوانین بینووسین و چەندەها جوانکاری پێ بدەین بە ئارەزووی خۆمان.

٥- MAKE AN AUTOMOVIE- واتە دروستکردنی جوڵەی خۆکرد، کە بەشی چوارەمی (EDIT MOVIE)ە ئێمە دەتوانین بەشێوەیەکی ئۆتۆماتیکی جوڵە بدەینە وێنە و بەشە ڤیدیۆییەکان، لێرەدا بە بێ ماندوو بوون دەتوانین پارچە ڤیدیۆیەکی زۆر جوان دروست بکەین، ئەمەش بەهەڵبژاردنی(MAKE AN AUTOMOVIE) و چەند هەڵبژاردنێک دەبینین کە بریتین لە چەند جووڵەیەکی تایبەت، بە ئارەزووی خۆمان دانەیەک هەڵدەبژێرین، پاش ئەوە دەتوانین ناونیشان (TITLE)ی بۆ دابنێین کە ئەویش چەندین جوڵەی تایبەتی تێدایە، هەروەها دەتوانین ڕەنگ و فۆنتی نووسینەکەش بگۆڕین. وەکو لە وێنەی (١)دا روون کراوەتەوە.

چۆنیەتی هەڵگرتنی MOVIE MAKER وەکو ڤیدیۆیەکی تەواوو کارکردنی لە میدیا پلەیەر یان هەر شوێنێکی تر وە یان دەتوانین بیخەینە سەر (CD) ی ئەگەر (CD) ڕایتەرمان هەبێ، ئەمەش بەکردنەوەی فایل و هەڵبژاردنی (SAVE MOVIE FILE) یان (CTRL+P)، هەروەها بەشی سێیەمی (MOVIE MAKER) یش کە بریتییە (FINISH MOVIE) تایبەتە بە چۆنیەتی هەڵگرتنی شتە جوڵاوەکان لە چەندین جێگا وەکو ئیمەیل، یان لە کۆمپیوتەرەکەمان، بەشێوەی ڤیدیۆی تەواو. وەکو وێنەی (٢)...



وێنەی ژمارە (٤)

# چۆنیەتی تۆمارکردنی تێبینی و دەستەواژەی دەنگی لەسەر وێنە لەبەرنامەی فۆتۆشۆپ



وێنەی (١)

ئامادەکردنی: عەزیز ئەسعەد

زۆر جار کەکار لەسەر وێنەیەک یان هەر فایلێکی فۆتۆشۆپ دەکەین، کاتێک دەرفەتی ئەوەمان نەبێت کە کارەکەمان تەواو بکەین جا لەبەر هەر هۆیەک بێت، بۆ ئەوەی لەپاشان کە گەڕاینەوە سەر کارەکەمان، ئەوەمان بیر بکەوێتەوە کە دەمانویست چی ئەنجام بدەین بۆ تەواوکردنی کارەکە، ئەوا پێویستمان بەوە دەبێ کە تێبینیەک تۆمار بکەین، دیارە بەرنامەی فۆتۆشۆپ ئەوەی بۆ رەخساندووین کە ئەو تێبینیە تۆمار بکەین، چ بەنووسین یان بە تۆمارکردنی دەنگ :

١- تۆمارکردنی تێبنی بە نووسین :

لەشەریتی ئامرازەکان ئامرازی (NOTE TOOL) هەڵدەبژێرین کە دەکەوێتە بەشی خوارەوەی شەریتەکە، وێنەی ژمارە (١)، پاشان کلیک لەسەر ئەو فایلە یان ئەو وێنەیە دەکەین کە مەبەستمانە تێبینی لەسەر تۆمار بکەین لەهەر جێگایەکی سەر فایلەکە کە دەمانەوێت تێبینی لەسەر بنووسین.

فایل بۆکسێکی بچوکمان بۆ دەکرێتەوە بەو ناوەی کە خۆمان دیاری دەکەین لەسەرەوە لەشەریتی تایبەت بە ئامرازەکە. بەکلیک کردن لەسەر بۆکسەکە دەتوانین راستەوخۆ دەست بە نووسین بکەین لەسەری و تێبینیەکەمان بنووسین .وێنەی ژمارە (٢)

دوای نووسینی تێبینیەکە بۆکسەکە دادەخەین بەکلیک کردن لەسەر ئەو چوار گۆشە بچوکەی کە دەکەوێتە لای راستی بەشی سەرەوەی فایل بۆکسەکە.



وێنەی (٢)

بەم جۆرە توانیمان ئەو تێبینیە لەسەر وێنەکە تۆمار بکەین کە دەمانەوێت .

هەرکاتێک ئەو فایلە یان وێنەیە بکەینەوە بۆ ئەوەی کاری لەسەر بکەین، دووجار کلیک دەکەین لەسەر ئەو چوار گۆشەی کەلەسەر وێنەکە دیارە و تێبینیەکەی تێدا نووسراوە، یان کلیکی لای ڕاستی لەسەر دەکەین و لەو لیستەی کە بۆمان دەکرێتەوە (OPEN NOTE) هەڵدەبژێرین و تێبینیەکە دەخوێنینەوە .

تێبینی:

أ- دەتوانین ڕەنگی فایل بۆکسەکەو قەبارەو جۆری فۆنتی نووسینەکە بگۆڕین بەدەست کاری کردنی شەریتی تایبەت بە ئامرازەکە، کە لەسەرەوە دیارە .

ب- بۆ ڕەش کردنەوەی تێبینیەکە کلیکی لای ڕاست لەسەر تێبینیەکە دەکەین و (DELETE NOTE) هەڵدەبژێرین .

ج- دەتوانین لەهەمان کات زیاتر لەتێبینیەیەک بنووسین .

٢- تۆمار کردنی دەستەواژەیەکی دەنگی :

لەڕاستیدا بۆ تۆمارکردنی دەستەواژەی دەنگی پێویستمان بە (MICROPHONE) (سماعة) ی گوێ دەبێت و دەبێ لەگەڵ ئامێری کۆمپیوتەرەکەمان بیبەستین .

لەشەریتی ئامرازەکان ئامرازی (AUDIO ANNOTATION TOOL) هەڵدەبژێرین کە شاردراوەتەوە لەژێر ئامرازی نووسینی تێبینی، وێنەی ژمارە (٣) . بەهەمان شێوەی پێشوو کلیک لەسەر فایلەکە یان وێنەکە دەکەین و ئەو فایل بۆکسەی خوارەوەمان بۆ دەکرێتەوە، وەک وێنەی ژمارە (٤) .



وێنەی (٣)

دوای بەستنی (MICROPHONE) ەکە کلیک لەسەر (START) دەکەین و بەم شێوەیە تۆمارکردن دەست پێ دەکات و دەتوانین هەرتێبینیەک بڵێین بەدەنگ بۆ تۆمارکردنی، دوای تەواوبوون لەتۆمارکردنی تێبینیەکە کلیک لەسەر (STOP) دەکەین بۆ ڕاگرتنی تۆمارکردنەکە . لەسەر فایلەکە وێنەی (سماعە) یەکی بچوکمان بۆ دەردەکەوێ. وێنەی ژمارە (٥) .

هەر کاتێک ئەو فایلە یان ئەو وێنەیە بکەینەوە بۆ ئەوەی کاری لەسەر بکەین، دووجار کلیک دەکەین لەسەر ئایکۆنەی تایبەت بە بۆ تۆمارکردنی دەنگ یان کلیکی لای ڕاستی لەسەر دەکەین و لەو لیستەی بۆمان دەکرێتەوە (PLAY) هەڵدەبژێرین و گوێ لە تێبینیە تۆمارکراوەکە ڕادەگرین، بە هەمان شێوەی پێشوو دەتوانین هەرکاتێک بمانەوێت تۆمارەکە ڕەش بکەینەوە و دەتوانین زیاتر لە تێبینیەکی دەنگی تۆمار بکەین.



وێنەی (٤)


وێنەی (٥)




# بەرنامەی DVD MOVI FACTORY

ئا: گۆران سلیمان




وێنەی (١)

بەرنامــەی دڤی فاکتۆری بۆ کاری دیــدی کۆپی و گۆرینی فایلەکانی سەوت وەبۆ ریکۆردکردن بەکاردێت . ئەم بەرنامەیە ڤێرژنی ٣,٥ وە کە تازە کەوتۆتە بازارە کانەوە ئەوکەســانەی کــرداری کۆپی کردن و کاری مۆنتاج ئەنجام دەدەن بەهەموو شــێوەکانیەوە وەک دەنــگ یاخــود ڕەســم یاخــود ئەلبــوم دروستکردن دەکەن ئەم بەرنامەیە کارئاسانیان بۆ دەکات.

وە ئــەم بەرنامەیــە چەنــد بەشــێکی گرتۆتــە خــۆی وەک:

(CREATE VIDEO DISK) بۆ ڕیکۆرد کردنی ڕەنگ بەکاردێت.

(CREATE SLIDESHOW DISK) بــۆ کۆپــی کردنــی وێنــەی ناوکۆمپیتەر وکردنی بەئەلبوم.

(CREATE MUSIC DISK) بــۆ کۆپــی و دروســتکردنی فایلی دەنگی.

(CREATE VIDEO DISK) بــۆ کۆپــی کردنــی فایلەکانــی ناو کۆمپیوتەرەکە واتە داتا.

(DIRECT DISK) کۆپــی کردن ڕاســتەو خۆ لەکامیراوە بۆ سی دی.




وێنەی (٢)

(EDIT DISK) بۆ خەزنکردن لەدیسکەوە بۆ ناو کۆمپیوتەر.
(COPY / FIT DISK) بۆ کۆپی کردن سیدی بۆ سیدی.
(DVD PLAYER) بۆ لێدانی سی دی دی ڤی دی.
ئێمە ئەگەر بمانەوێ ریکۆردەری فلیمێک بکەیین ئەوا دەچینەسەر (CREATE VIDEO DISK) کلیک دەکەین پاشان VCD هەڵدەبژێرین (OK) دەکەین (وێنەی ٣).
لەپاشان کەدەبینین وێنەی شاشەیەک دەردەچێت ئەوا دەتوانین زۆر بەئاسانی ریکۆردی بکەین وەلەناو مایدۆکۆمینت هەڵی بگری (وێنە ٤)

تێبینی :
بۆ ریکۆرد کردن پێویستیمان (بەکارت گرین) هەیە واتا ئەو کارتەی کەدەتوانێت ڤیدۆ بۆ ناوکۆمپیتەر بگواستێتەوە. وەبەشەکانی تریش لەداهاتوودا باسی دەکەین.



وێنەی (٣)



وێنەی (٤)

# پەیوەندی نێوان خشتەکان لە بنکەی زانیاری ئەکسێس
# Tables Relationship in Access MDB

ئامادەکردنی: ڕێبوار نوری سعید

وێنەی (١)




وێنەی (٢)

دوای تەواو بوون لە دروست کردنی خشتەکان وە بۆ وەرگرتنی داتا لە زیاتر یەک خشتەدا و کۆکردنەوەو پیشاندانی لە یەک کاتدا و لەیەک کویری یان فۆرم یان راپۆرت دا پێویستیمان بە دروست کردنی پەیوەندی هەیە لە نێوان ئەو خشتانەی کەوا زایناریەکانیان پەیوەندیان بەیەکەوە هەیەو کە هەر خشتەیەک زانیاری لەسەر لایەنێک لە بابەتی بنکەی زانیاری تێدا کۆگا کرابێت.

بۆ نموونە ئەم فۆرمە داتا لە دوو خشتە وەردەگرێت: (وێنەی ١)

١- زانیاری دەربارەی پەرتووکەکان لە خشتەی TBLBOOKS وەردەگرێت.

٢-زانیاری دەربارەی هەر دانەرێک لە خشتەی TBLAUTHORS وەردەگرێت.

وە هەر دانەرێک لەوانەیە زیاتر لە یەک پەرتووکی هەبێت، ئەمە لەکاتی نووسینی داتا کێشەی کات دروست دەکات ئەگەربێت زانیاری دەربارەی دانەرەکان و پەرتووکەکان هەمووی بەیەکەو لەیەک خشتەدا کۆگەکرابێت ئەوا دەبێت لە کاتی نووسینی داتا زانیاری دەربارەی دانەرکە چەندین جار دووبارە بکەینەوە بە پێی دووبارە بوونەوەی تۆمارەکانی پەرتووکەکان، بۆیە بۆ کەمکردنەوەی کاتی نووسینی داتا باشترە بکرێت بە دوو خشتە، خشتەیەک تایبەت بێت بە زانیاری تایبەت بە دانەرەکان بکرێت بە خشتەی سەرەکی و خشتەی دووەمیش تایبەت بێت بە زانیاری دەربارەی پەرتووکەکان و بەلانسەکانیان لە کۆگاکەدا بکرێت بە خشتەی لاوەکی.

بۆ دروستکردنی پەیوەندی RELATIONSHIP لە نێوان دوو کێلگە لە دوو خشتەدا هەروەک لەو نموونەیەی سەرەوە ئەبێ کێلگە پەیوەندیدارەکان لە هەردوو خشتەدا جۆرێک ڕێبکخستن لە نێوانیاندا هەبێت تاکو بتوانیت داتای ناو هەردوو خشتەکە لەسەر یەک فۆرم پیشان بدات.

پەیوەنداری RELATIONSHIP لە نێوان خشتەکان کاتێک کار دەکات کە:

١- هەر دوو کێلگەی بەستراوەکان لە هەردوو خشتەکە بەیەک بچن لەرووی جۆری داتا (واتا یەک جۆری داتا DATA TYPE یان هەبێت).

٢-هەر دوو کێلگەی بەستراوەکە لە هەردوو خشتەکە هەمان ناویان هەبێت.

لە زۆربەی حاڵەتەکاندا کێلگە پەیوەندیدارەکان کلیلی سەرەتایی PRIMARY KEY خشتەیەکە (بە خشتەی سەرەکی ناودەبرێت، وە کلیلی دەرکی FOREIGN KEYخشتە پەیوەندیدارەکەی ترە (بەخشتەی لاوەکی ناودەبرێت).

### جۆرەکانی پەیوەندی

سێ جۆر پەیوەندی هەیە:

١- جۆری ONE-TO-MANY RELATIONSHIP :

لە هەموو جۆرەکان بلاوترە، وە لەم جۆرەدا تۆمارێک لە خشتەی یەکەم (خشتەی سەرەکی) بۆی هەیە زیاتر لە یەک تۆماری هەبێت لە خشتەی دووەم (خشتەی لاوەکی)، بەلام تۆمارێک لە خشتەی لاوەکی تەنها یەک تۆماری هاوداتای هەیە لە خشتەی سەرەکی.

تێبینی: مەرجی دروست کردنی ئەم جۆرە پەیوەندییە ئەوەیە کە یەکێک لە دووکێلگە بەستراوەکان کلیلی




وێنەی (٣)

سەرەتایی بێت یان تاکە ریزکەر UNIQUE INDEX بێت لە خشتەیەکداو وە کلیلی دەرەکی بێت FOREIGN KEY بێت لە خشتەی دووەمـدا ئـەوا ئەو کات پـەیوەندی لـە جۆری ONE-TO-MANY RELATIONSHIP لە نێوان هەردوو خشتەکەدا دروست ئەبێت.

٢- جۆری MANY-TO-MANY RELATIONSHIP :

لەم جۆرەدا تۆمارێک لە خشتەی سەرەکی بۆی هەیە زیاتر لە یەک تۆماری هەبێت لە خشتەی لاوەکی، هەروەها تۆمارێک لە خشتەی لاوەکی زیاتر لەیەک تۆماری هـاوداتـای هەیە لە خشتەی سەرەکی. ئەم جۆرەیان تەنها لەوکاتە دروست ئەکرێت کە خشتەی سێیەم پێناسە بکرێت کە ناودەبرێت بە (JUNCTION TABLE) کە کلیلی سەرەتاییەکەی لە دووکێڵگە پێک دێت، کە هەرەیەکان کلیلی سەرەتاییە لە خشتەیەک (واتە یەکێکیان کلیلی سەرەتاییە لە خشتەی یەک و ئەوی تریان کلیلی سەرەتایی یە لە خشتەی دووەم) و لە هەمان کاتدا هەردووکیان کلیلی دەرەکین لە خشتەی سێیەمدا.

ئەم جۆرەیان لە بنەرەتدا دوو پەیوەندیە لە جۆری ONE-TO-MANY RELATIONSHIP ـە لە نێوان خشتەی یەکەم و سێیەم وە خشتەی دووەم وسێ یەمدا:

نـموونـە: پـەیـوەنـدی نـێـوان خـشـتـەی ORDERS لـەگـەڵ خـشـتـەی PRODUCTS لـە جـۆری MANY-TO-MANY RELATIONSHIP ئـەویـش لە رێـگـەی دروسـتـکـردنـی دوو پـەیـوەنـدی لـە جـۆری ONE-TO-MANY RELATIONSHIP یـەکـێـکـیـان لـە نـێـوان خـشـتـەی ORDERS و خـشـتـەی ORDER DETAILS TABLE ئـەوی دووەمـیـان لـە نـێـوان خـشـتـەی PRODUCTS و خـشـتـەی ORDER DETAILS TABLE، بەم شێوەیە خشتەی یەکەم و دووەم پەیوەندی راستەوخۆیان نیە بەڵکو پەیوەندیەکەیان لە رێگەی خشتەیەکی ناوەندی تێدەپەرێت، (وێنەی ٢).

کێڵگەی ORDER ID کلیلی سەرەکیە لە خشتەی ORDERS.

هەروەها کێڵگەی PRODUCTID کلیلی سەرەکیە لەخشتەی PRODUCTS.

هەردوو کێڵگە کە بەهەمان ناو و جۆری داتا کلیلی دەرەکین لە خشتەی ORDER DETAILS.

لەم جۆرەدا هەر ORDER ێک بۆی هەیە چەندەها PRODUCT لە خۆی بگرێت

هەروەها هەر بەرهەمێک بۆی هەیە لە چەند ORDER ێک هەبێت.

تێبینی: ئەم جۆرە پەیوەندیەکی ناراستەوخۆیەو ئەبێ سێ خشتە بەشداری تیادا بکات و مەرجی دروست کردنی ئەم جۆرە پەیوەندییە ئەوەیە کەوا دوو پەیوەندی لە جۆری ONE-TO-ONE RELATIONSHIP لە نێوان خشتەی یەکەم و سێیەم وەهـەروەهـا لـە نێوان خشتەی دووەم و سێیەم هەبێت و کلیلی دەرەکی FOREIGN KEYS خشتەی سێیەم لە دوو کێڵگە پێک دێت کە هـەر کێڵگەیەک کلیلی سەرەتایی PRIMARY KEY خشتەیەک بێت لە خشتەی یەکەم و دووەم ئەوا پەیوەندی لە جۆری MANY-TO-MANY RELATIONSHIP دروست ئەبێت لەنێوان خشتەی یەکەم و دووەم.

٣- جۆری ONE-TO-ONE RELATIONSHIP :

لـەم جـۆرەدا تۆمارێک لە خشتەی سـەرەکی تەنها یەک تۆماری دەبێت لە خشتەی لاوەکی، هەروەها تۆمارێک لە خشتەی لاوەکی تەنها یەک تۆماری هاوداتای هەیە لە خشتەی سەرەکی. ئەم جۆرە پەیوەندیە زۆر بڵاونیە، چونکە ئەکرێ هەموو ئەو زانیاریە بەیەک پەیوەندکراوە لە یەک خشتەدا کۆ بکریتەوەو کۆگەبکرێت، ئەکرێ ئەم جۆرە بەکاربێت بۆ دابـەش کردنی خشتەی گـەورە بۆ دووبـەش یان زیاتر یان لە کاتی گرنگی ئاسایشی جۆرە داتایەک ئەتوانیت ئەو کات ئەو کێڵگانەی داتاکەیان تێدایە لە خشتەیەکی تردابنێیت و بەم جۆرە پەیوەندیە بیبەستیتەوە بە خشتەی سەرەکی، یان لە کاتی ئەوەی زانیاریەکت هەبێت تەنها بۆ چەند تۆمارێک بەکاربێت ئەوجا جیای ئەکەیەتەوەو لەخشتەیەک و خشتەکەش بە پەیوەندی لەم جۆرە بە خشتە سەرەکیەکە دەبەستیتەوە.

تێبینی: مەرجی دروست کردنی ئـەم جۆرە پەیوەندییە ئەوەیە کە هەردوو کێڵگە بەستراوەکان کلیلی سەرەتایی بن یان تاکە ریزکەر UNIQUE INDEX بن هەریەکە لە خشتەکەی




وێنەی (٤)

خۆیدا ئەوا پەیوەندی جۆری ONE-TO-ONE RELATIONSHIP لە نێوان هەردوو خشتەکەدا دروست دەبێت.

## دروست کردنی پەیوەندی لە نێوان خشتەکان

کاتێ تۆ پەیوەندی لەنێوان دوو خشتە دروست ئەکەیت مەرج نیە کێلگە پەیوەندارەکان هەمان ناویان هەبێت بەڵام مەرجە هەمان جۆری داتای هەبێت جگە لەو حاڵەتەی کە کێلگەکە کلیلی سەرەتایی خشتەی یەکەم بێت و جۆری داتاکەی AUTONUMBER بێت ئەتوانیت بیبەستیتەوە بە کێلگەیەک لە ختشەی دووەم داتاکەی لە جۆری NUMBER بێت بەڵام دەبێت هەمان قەبارەیان هەبێت.

دروست کردنی پەیوەندی ONE-TO-MANY یان ONE-TO-ONE:

١- هەموو خشتە کراوەکان دابخە چونکە ناتوانی پەیوەندی دروست بکەیت لە کاتی کردنەوەی خشتەکان.

٢- بۆ ئەوەی چوارچێوەی بنکەی زانیاری بێتە سەرشاشە دوگمەی F11 دابگرە.

٣- یەک کلیک بکە لەسەر دوگمەی پەیوەندیەکان لە لیستی ئامرازەکان TOOLS BAR.

٤- ئەگەر پێشتر هیچ پەیوەندیەکت دروست نەکردبێت، خانەی هەڵبژاردنی خشتەکان بۆ پەیوەندی دێتە سەر شاشەو لە پشتیەوەی چوارچێوەی RELATIONSHPS دەردەچێت، (وێنەی ٣).

تێبینی: ئەگەر پێویستیت بە زیاد کردنی خشتەیەک بوو بۆناو پەیوەندیەکەت، یەک کلیک بکە لەسەر دوگمەی زیاد کردنی خشتە لە لیستی ئامرازەکان.

٥- دوو کلیک بکە لەسەر ناوی ئەو خشتانەی ئەتەوێت پەیوەندیان لە نێوان دروست بکەیت، دوو کلیک بکە لەسەر ناوی خشتەی TBLAUTHERS ناوی خشتەی TBLBOOKS ئنجا کلیک بکە لەسەر دوگمەی CLOSE، ئەبینی خانەی هەردوو خشتەکە بە ناوی کێلگانیەوە هاتوتە ناو چوارچێوەی پەیوەندیەکان.

٦- بۆ دروست کردنی پەیوەندی، نیشانەی ماوس بگوازەرەوە بۆ سەر کێلگەی AUTHORID لەخشتەی TBLAUTHORS کە کێلگەکە تیایدا کلیلی سەرەتاییە، ئنجا دوگمەی لای چەپی




وێنەی (٥)

ماوس کلیک بکەو پەنجەت هەڵمەگرە ئنجا نیشانەی ماوس رابکێشە بۆ سەر کێلگەی AUTHORID لە خشتەی TBLBOOKS ئنجا پەنجەت لەسەر دووگمەی ماوس هەلگرە، دوای ئەوە یەکسەر ئەم خانەی EDIT RELATIOHSHOPS خوارەوە دێتە سەر شاشە: (وێنەی ٤).

تێبینی: لە زرۆبەی حاڵەتەکاندا تۆ پەیوەندی لە نێوان کلیلی سەرەتایی خشتەی یەکەم و وە کێلگەیەک لە خشتەی دووەم دروست ئەکەیت کە هەمان ناو و جۆری داتای هەبێت وبە کلیلی دەرەکی دەناسرێت بۆ خشتەی دووەم.

٧- لە خانەی EDIT RELATIONSHIPS کلیک بکە لەسەر دوگمەی JOIN TYPE بۆ دەست نیشان کردنی چۆنیەتی مامەڵەکردنی پەیوەندیەکە، خانەی JOIN PROPERTIES دێتە سەر شاشە بەووردی بیخوێنەوەو یەکێک لە جۆرەکانی مامەڵەکردن هەڵبژێرەو ئنجا کلیک بکە لەسەر دوگمەی OK .

- بۆ نموونەی ئێستاماندا جۆری سێ یەم هەڵبژێرەو کلیک بکە لەسەر دوگمەی OK. (وێنەی ٥).

٨- دوای ئەوە کلیک بکە لەسەر دوگمەی CREATE دوای ئەوە هێڵی پەیوەندی لە نێوان خشتەکان دروست دەبێت، (وێنەی ٦).

٩- دوای تەواو بوون کلیک بکە لەسەر دوگمەی X بۆ داخستن لە چوارچێوەی پەیوەندیەکان ئنجا نامەیەکی ئاگادارکردنەوە دێتە سەر شاشە داوای کۆگەکردنی پەیوەندیەکەت لێ دەکات کلیک بکە لەسە دوگمەی SAVE. (وێنەی ٧).

تێبینی: ئەتوانیت پەیوەندی لە نێوان خشتەو خشتە، یان خشتەو کوێری یان کوێری و کوێری دروست بکەیت.




وێنەی (٧)




وێنەی (٦)

# بەرنامەی Cove Center بۆ ئاگادارکردنەوی کۆمپیتەرەکەت لە هەر مەترسیەکی تێک چوون

**ئا: تاهیر کاکە**

زۆر جاری وا هەیە ئێمە کەکار لەسەر کۆمپیتەر دەکەیـن ئێمە نازانین چ کاتێک کۆمپیتەر بەرو تێک چوون دەچێت یاخود لەناوکاو تێک دەچێـت، بۆیە بە یارمەتی ئەو بەرنامەیە دەتوانین ئاگاداربین لەهەر مەترسیەک کەتوشی کۆمپیتەرەکە دەبێت، ئـەم بەرنامەیە پێش تێک چوون دەسـت دەکات بـە هۆڕیـن لێدان و ناوەسـتێت تاوەکو بکۆمپیتەرەکە نەکوژێنیتەوە

وەلەکاتی هۆڕین لێدانەکە لەشاشەکەی خۆی پێمان نیشـان دەدات کەچ کێشەکی تووش بووە.



وێنەی (١)



وێنەی (٢)




# جۆرەکانی دابەزاندنی ویندۆز (setup)

ئامادەکردنی: باوکی ماریا

بەڕێزان لە کاتی دابەزاندنی سیستەمی ویندۆز، وە نووسینی فەرمانی SETUP/? چەندین جۆری جیاوازمان بۆ بەدیاردەکەوێ لــە دابەزاندنــی ویندۆز، ئەمەو لە خشــتەی خوارەوە باســی جۆرەکانی دابەزاندنی ویندۆز دەکەین .

SETUP /C :- دابەزاندنــی سیســتەم بەبــێ بەکارهێنانــی "DISK CASH" .

SETUP/D : = دابەزاندنــی سیســتەم بە بــێ بەکارهێنانی مەلەفاتی سیستەمی ماوە لە ئامێری پێشوو .

SETUP /ID := بەجــێ نەگەیاندنی کرداری تاقی کردنەوەی بۆشایی پێویست لەسەر ئامێرەکە .

SETUP /IE := بەجێ نەگەیاندنی کرداری پێکهێنانی دسکی فریاگوزاری " STARTUP DISK " .

SETUP / IH := بەجێ نەگەیاندنی کرداری تاقی کردنەوەی مەلەفاتی سیستەم .

SETUP / IM := بەجێ نەگەیاندنی کرداری تاقی کردنەوەی زاکیرە .

SETUP / IN := بەجــێ نەگەیاندنی کرداری دابەزاندن بەبێ دابەزاندنی بەشی تایبەتی تۆڕەکان .

SETUP / IP := بەجێ نەگەیاندنی کرداری ناسینی پارچەکانی کۆمپیوتەر کەوا تایبەتمەندی " PLUG &PLAY " تیا نەبێ .

SETUP / IR : = بە جێ نەگەیاندنی کرداری تاقی کردنەوەی (BIOS) .

SETUP /IS : = بەجێ نەگەیاندنی کرداری (SCANDISK) .

SETUP / IV : = بەجێ نەگەیاندنی کرداری پیشــاندانی ئەو شاشانەی کەوا بەدیار دەکەون لە کاتی دابەزاندنی ویندۆز، کە شەرحی دابەزاندنەکە دەکەن .

SETUP / L : = دابەزاندنــی کارپێکــەری ماوس لە جۆری (LOGITECH) لە جێگای کارپێکەرەکانی مایکرۆسۆفت .

SETUP / M : = بڕینــی ئــەو دەنگەی کــە گوێمان لێ دەبێ لەکاتی کرداری دابەزاندن .

SETUP / N : = دابەزاندنــی ویندۆز بەبــێ ئیــش کردنــی ماوس.

SETUP / NM : = بەجێ نەگەیاندنی کرداری تاقی کردنەوەی جۆری پرۆسیسەرەکە .

SETUP / NOSTART : = بەجــێ گەیاندنــی کــرداری گواســتنەوەی مەلەفــات بــە تەنهــا، وە لەدواییــدا کارپێکردنی ئامێرەکە لە ڕێی هارددیسکەوە .

SETUP / NTLDR : = بەجــێ نەگەیاندنــی کــرداری تاقــی کردنەوەی سیستەمی کارپێکردنی پێشوو .

SETUP / T:DIR>= : = دیاریکردنــی شــوێنی فۆڵــدەری مەلەفاتی کاتی (TEMP)، کە سیســتەمەکە پێکی دەهێنێ لەکاتی کرداری دابەزاندن .

# چۆنیەتی بزرکردنی فایلێک لە ویندۆز

نووسینی: ابراهیم محمود

ئەگەر بمانەوێ فایلێک بپارێزین و کەس نەتوانێت بیکاتەوە یاخود دەست کاری بکات بەدانانی سیستەمێکی پارێزراوئێمە لەوکاتە زۆر پێویستمان بەو بەرنامەیە دەبێت ئەگەر بێت و بمانەوێ کۆمپیوتەرەکانمان لەدەستکاری بپارێزین بەتایبەتی لە دەزگایەک کە چەند کەسێک کار لەسەر یەک ئامێری کۆمپیوتەر دەکەن یاخود یەکێک لەدوای تۆ کار لەسەر کۆمپیوتەرەکەی تۆدەکات بەم شێوەیە لەرێگای ئەو بەرنامەیە دەتوانیت ئەو شتانەی پێویستتە لەناو فۆڵدەرێک بزریان بکەیت یاخود ژمارەی



وێنەی (١)



وێنەی (٢)



وێنەی (٣)



وێنەی (٤)

نهێنی بۆفۆڵدەرەکان دابنێیت بەم شێوەیە (وێنە ١).

پاشان سەیری وێنە دوو بکە بۆدانانی سیستەمی پارێزراو (وێنە ٢).

دانانــی پارمەتیــدەری کورتکراوەیەک بزرکردن و هێنانەوە (وێنە ٣).

بەم شــێوەیە تۆ توانیت ئــەو فۆڵدەرە بپارێزیت لەدەست کاری (وێنە ٤).

پاشــان ئــەم ئایکۆنــە کلیــک بکــە بۆ بزرکردنی فۆڵدەرەکان (وێنە ٥).

پاراســتنی فۆڵدەرەکــەت بەدانانــی ژمارەی نهێنی (وێنە ٦).



وێنەی (٥)



وێنەی (٦)

# کۆمەڵێک فلتەری زۆر جوان بۆسەر بەرنامەی فۆتۆشۆپ

بێگومــان هــەر بەرنامەیەک کەچەند کارێکــی دیاری کراوی پێســپێردراوە لەهێزی خۆی زیاتــر کاری پێناکرێ هەردەبێت کەچەند پارچەیەکی زیادی بۆ دروست بکرێت بۆکاری زیاترو جوانتر بەرنامەی فۆتۆشۆپیش بریتییە لەوبەرنامانەی کەچەند پلــەگ ئینێکی جوانــی بۆدروســتکراوە کەهەریەکێکیان چەند کارێکی جوانیان پێدەکرێت لەوانە:

١- ALIENSKIN_BLACK_BOX_21
٢- ALIENSKIN_EYE_CANDY_31
٣- ALIENSKIN_EYE_CANDY_4000
٤- ALIENSKIN_XENOFEX_11
٥- KPT_50
٦- KPT_60
٧- KPT_70
٨- LENS-FLARE-GLOW

ئەو پارچانەو چەندانی تر بەرنامەی فۆتۆشۆپ دەرازێننەوە ئەگــەر هەریــەک لەمانە دابەزێنیتە ســەر ئامێــری کۆمپیوتەر هەندێکیــان راســتەو خۆ دەچنە نــاو بەرنامەی فۆتۆشــۆپ و هەندێکیشــیان دەبێــت لەکاتی دابەزاندن خــۆت بیان بەیتە ناو بەرنامەی فۆتۆشۆپ هەر هەمووشیان لەبەرنامەی فۆتۆشۆپ لە FILTERS زیاد دەبن

# بەهۆی Auto off زۆر بەخێرایی کۆمپیوتەرەکەت بکوژێنیتەوە




**ئا: نازەنین رەسوڵ**

خۆشەویستان زۆر ئەوەمان هاتووتە پێش کە ئێمە زۆر بە خێرایی لەسەر کۆمپیوتەرەکانمان هەڵدەستین بەهۆی کارێکەوە کەدێتە پێشمان بەلام لەبەر کوژاندنەوەی کۆمپیتەرەکە چەند خولەک دوادەکەوین بەلام ئەم بەرنامەیە تەنها بەیەک چرکە دەیکوژێنێتەوە



# کۆمەڵەی ئەو بەرنامانەی کە دەتوانیت بەهۆیانەوە نەخشەی تەواوی ماڵپەڕێک بکێشیت




پەرژین محمد

دروست کردنی دیزاینی ماڵپەڕێک پێویستی بە فکرو بیرو هۆش و سەلیقەی ئەو کەسەیە کەدەیەوێت دیزاینی ماڵپەڕێک بکێشیت و بە جوانترین شێوە یان بە سەرنج ڕاکێشترین شێوە بینەخشێنێت، هەڵبەتە سەرەرای ئەوەی سەرەوە باسمان کرد پێویستمان بە کۆمەڵێک بەرنامە دەبێت تا وای لێدێت ماڵپەرەکە ئامادەی دانان دەبێت لەسەر تۆری ئەنتەرنێت، زۆر گرنگیشە زانیاریت هەبێت لەسەر ئەوە بەرنامانەی کە کاری دیزانی ماڵپەرەکان تەواو دەکەن گرنگترین ئەو بەرنامانەش : .

- ADDWEB 2.36 بۆ دانانی ماڵپەرەکەت لەناو سەدان بزوینەری گەراندا.
-MACROMEDIA FLASH یەکێک لە بەهێزترین بەرنامەکانی دیزاین
-FRONT PAGE ئاسانترین بەرنامەی دروست کردنی ماڵپەر
-COFFE FTP 3.5بۆ دانانی لاپەرەکان و ئەپلۆد کردنیان بۆ ناو تۆری ئەنتەرنێت
- FLASH 4.0 FULL بەرنامەیەک بۆ دروستکردنی ئیفیکتی جوان و دروستکردنی لاپەرەکانی ئەنتەرنێت
- WS FTP PRO 6.0 بۆ ئەپلۆد کردنی ماڵپەر
- APPLET NAVIGATION FACTORY 1.0 بۆ دروست کردنی ئایکۆنەکانی ماڵپەر بە جوانترین شێوە
- FREE SUBMIT V1.0 بۆ دانانی ماڵپەر لە ناو ١٥٠٠ بزوێنەر گەراندا بێ بەرامبەر
- SWISH بۆ دروست کردنی ئیفێکت و جوانکردنی ماڵپەر
- HTML FILTER 2.0 بۆ پاکردنەوەی ماڵپەر لەو هەموو جێبە جێکاریە بێسوودانەی لە ئەنجامی دروست کردنی ماڵپەر بە بەرنامەی فرۆنت پەیج دروستت کردون
- ANFY JAVA 1.4.3 بۆ دەست کاری کردن و جوانکردن و دانانی ئیفێکتی جوان بۆ وێنەکان
- ANFY ئەو بەرنامەیە زیاتر لە ٤٠ جێبەجێکاری جاڤای تێدایە.

# زانیاریەک لە گۆڕینی ناو (Rename)


وێنەی (١)


وێنەی (٢)

ئازیـزان زۆرجـاری واهەیە کـە ئێمە لەسـەر کۆمپیتەرەکەمان کۆمەڵە فایلەک هەیە یاخود کۆمەڵێک وێنەمان هەیە گەر بمانەوێ ناوەکەی بگۆرین واتە RENAME بکەیـن کاتێکی زۆر دەخایەنێت بۆیە بەم زانیاریـە رێگاکەتـان بۆ ئاسـان دەکات لەسـەرەتادا دەچینـە ئـەو شـوێنەی کە دەمانەوێت ناوەکان بگۆرین (وێنەی ١).

لەپاشـان ناوفایلەکـە دەسـت نیشـان دەکەیـن واتە CTRL +A (وێنەی ٢) کلیکی راسـتی ماوس دەکەین هێمای RENAME هەڵدەبژێرین (وێنەی ٣).

لەپاشان ناوێک دەنوسین بەئارەزووی خۆمان (وێنەی ٤).

لەکۆتاییدا کلیکی چەپ دەکەین و ئینجا دەبینیـن هەموو رسـمەکان بەناوکان و ژمارەکراو دەبینین.


وێنەی (٣)


وێنەی (٤)

# کاتێک کۆمپیوتەرەکەت دادەگیرسێنیت یەکسەر سیدی رومەکەت دەپشکنێت چۆن ئەم کردارە لابەرین



وێنەی (١)



وێنەی (٢)

حسن عمر

هەموو کاتێک کە کۆمپیوتەر دادەگیرسێنیت ئەوا یەکسەر کۆمپیوتەر خۆکاری دەست بەپشکنینی سیدی ناو سیدی رومەکە دەکات یان بەواتایەکی تر سیدی رومەکە دادەگیرسێت ئەمەش زۆرجار کردنەوەو داگیرساندنی کۆمپیوتەر دوادەخات جا بۆ چارەسەر کردن و رێگە گرتن لەم کردارە پێویستە بەم هەنگاوانە لەگەڵ من بیت لەسەرەتادا دەچینە (RUN) لەوێشدا ئەم زاراوەیە دەنوسین (REGEDIT) و (OK) دەکەین دواتر وەک لەوێنەی (١) دیارە ئەم چوارگۆشەسە دەکرێتەوە لەویوە بەشی (HKEY_LOCAL_MACHINE) پاشان (SYSTEM) هەڵدەبژێرین ئینجا لەدواییدا (CURRENTCONTROLSET) هەڵدەبژێرین هەروەک لەهەمان وێنەی پێشو رونکراوەتەوە پاشان (CONTROL) هەڵدەبژێرین، ئینجا ئەچینە سەر بەشی (SESSION MANAGER) بروانە وێنەی (٢) لەوێش راستەوخۆ دوو کلیک لەسەر (BOOTEXECUTE) دەکەین لەوێش هەموو ئەم ئاماژانە دەسڕینەوە کە تایبەتن بە (AUTOCHECK) بروانە وێنەی (٣) پاشان (OK) دەکەین .



وێنەی (٣)



# هۆیەکانی سەر هەڵدانی تاوانەکانی کۆمپیوتەر

ئا: عەزیز تاهیر

دزین و تەزویرکردن لە ڕێگای کۆمپیوتەر هەروەک ڕێگای ئاسایی وایە، بەڵام لە ڕێگەی کۆمپیوتەر خێراتر و ئاسانترە، هۆیەکانی سەر هەڵدانی تاوانەکانی کۆمپیوتەر بە شێوەیەکی فراوان دەگەڕێتەوە بۆ ئەم هۆیانە:

١. زیاد بوونی خەڵکی شارەزا لە بواری کۆمپیوتەر، لەم ڕۆژگارەدا خەڵکێکی زۆر کۆمپیوتەر بەکار دەهێنرێنن، ڕۆژ لە دوای ڕۆژیش خەلکی شارەزا زیاتر دەبێت بە تایبەتی هەندێک کۆمپیوتەر دەبێتە پیشەی ژیانیان.

٢. ئاسەواری تاوانی کۆمپیوتەر دیار ناکەوێت یاخود دەتوانرێت ئاسەوارەکەی بشاردرێتەوە، ترسی تاونبارەکان زۆر کەمترە و وەکو تاوانی ئاسایی نییە کەسی تاوانبار لە شوێنی تاوانەکە دەستگیر بکرێت.

٣. قازانجی تاوانی دزی کردن و گەمە پێکردن و تزویر زۆرترە، لێکۆلەرەوەکانی ئەمەریکا لە سالی ١٩٩٥ دەریان خست ڕێژەی قازانجی تاوانەکانی کۆمپیوتەرگەیشتە (٦٠٠٠٠٠) شەش سەد هەزار دۆلار بەڵام قازانجی تاوانەکانی ئاسایی گەیشتە نیوەی ئەم ڕێژەیە بە نزیکەیی.

# بەرنامەیەک دەتوانێ ترپەی لێدانی پەنجەکان لەسەر کیبۆرد ئاشکرا بکات



ئا: زەهرا حسین

ئەو بەرنامەیە دەتوانێ لەسەدا نەوەدی پاس وۆرد کە لە پێنج پیت پێکهاتوون ئاشکرا بکات

لندن : ڕۆژنامەی الشرق الاوسط

لە زانکۆی کالیفۆرنیا زاناکان توانیان ڕێگەیەک ببیننەوە بۆ گۆڕینی لێدانی دوگمەکانی کیبۆرد بۆ نووسینێکی ڕوون و ئاشکرا.

لە راپۆرتێکدا کە بەم دواییە بڵاوکراوەتەوە، زاناکان ڕوونیانکردەوە کە چۆن توانیویانە بەرنامەیەک گەشەپێبدەن کە توانای هەیە کە ئەو دەنگانەی کە لە ئەنجامی لێدانی دوگمەکانی سەر کیبۆرد پەیدا دەبن، کۆبکەنەوە و بیگۆڕن بۆ نووسینێکی روون وئاشکرا.

ئەو بەرنامە نوێیە پشت بەو راستیە سادە دەبەستێ کە دەڵێت ئەو دەنگەی کە لە لێدانی دوگمەی A پەیدا دەبێ جیاوازە لەو دەنگەی کە لەلێدانی دوگمەی T پەیدا دەبێ، وە بەپێی قسەی دۆک تایگەر، مامۆستای زانستەکانی کۆمپیوتەر لە زانکۆی کالیفۆرنیا ((ئەگەر تەماشای ئەو دمبکە بکەین کە خەڵکی کۆنگۆ لە ئەفریقیا بەکاری دێنن، لە هەر جێگەیەک بدەیت لە دمبکەکە ئەوا دەنگێکی جیاوازی هەیە، یان ئاوازێکی جیاوازی هەیە))، ئەوا هەمان ئەو شتەیە کە لە کیبۆرد بەکاردێت چونکە لەوحەیەک هەیە لەژێر دوگمەکانی کیبۆرد و بەلێدانی هەر دوگمەیەک ئەو دەنگێکی یان ئاوازێکی جودا هەڵدەستێت.

## ئاوازی دوگمەکان

دوای ئەوەی کە توانیان ئاوازی دوگمەکان لەیەکترجودا بکەنەوە و بیان ناسنەوە، دۆک تایگەر مامۆستا لە زانستەکانی کۆمپیوتەر لە زانکۆی کالیفۆرنیا، هەڵسا بە بەکارهێنانی جۆرە تۆژینەوەیەک کە پێی دەوترێ ( نەزەریەی فێربونی ئاماری)، ئەمەش بۆ ئەوەی بتوانن کە ئاوازە جیاوازەکان دابنێن لە نەخشەیەک کە پێک دێت لە چەند بەشێکی لەیەکچوو بۆ ئەوەی بگەین بە شێوەیەک لە شێوەیەکانی هەستکردن بەو دەنگانە، یاخود ناسینەوەی نووسینەکە. وە دەتوانرێ هەندێ ڕێگەی ڕاستکردنەوەی هەڵەی ڕێزمانی بەکاربێت بۆ ئەوەی نووسینەکە چاک بکرێتەوە پێش ئەوەی کە هەموو دەنگەکانی کیبۆرد بگۆڕێت بۆ نووسینێک کە لەتوانادا هەبێت کە بخوێنرێتەوە.

نەزەریەی فێربونی ئاماری ناوێکیتری هەیە کە پێی دەڵێن (فێربوونی ئالی)، کە ڕێگەیەکە کەیارمەتی کۆمپیوتەرەکان دەدات کە هەندێک لە زانیاریەکان تێبگات و بیخوێنێتەوە، دۆک تایگەر دەڵێت کە ئەو بابەتە لەماوەی دە سالی رابردوودا زۆر بایەخی پێدراوە کە لە ئەنجامدا بووە هۆی دروستبوونی چەند بەرهەمێک وەکو بەرنامەی گەڕان بەدوای نامەی ئەلیکترۆنی(ئەوەی کە نامانەوێ) و ناسینەوەی قسە و ووشەکان.

وە لەبەرئەوەی کە ڕێگەی دۆک تایگەر و هاوڕێکانی لە زانکۆی کالیفۆرنیا پشت دەبەستێت بە دەنگی دوگمەکان نەوەک ئەو وەختەی کە لێدانی دوگمەکان دەیخایەنێت، کەواتە هەردوو ڕێگەی چاپکردن : پەنجە خشاندن بە دوگمەکان و پیتەکان، یان گەڕان بەدوایان و لێدانیان بەهۆیەوە دەتوانین کە ڕەمزەکانی شیبکەنەوە و بیانناسینەوە.

## گوێگرتن و هەست ڕاگرتن لە دەنگەکان

فیکرەی گوێگرتن و هەست راگرتن لە کیبۆردلەسەرەتای شەڕی سارد پەیدابوو، ئەوکاتەی کە جاسوسەکانی سوفیەتی هەلسان بە گوێگرتن لەسەر ئامێری چاپی کارەبایی کە لەلایەن کۆمپانیای IBM دروستکرابوو و لە سەفارەتی ئەمریکا لە مۆسکۆ ئیشی پێدەکرا، دوای ئەوەش ئامێری تۆمارکردنی دەنگی پیتەکان و دوگمەکان پەرەی پێدرا، بەلام زاناکانی زانکۆی کالیفۆرنیا چونە ناو مەیدانێکی نوێ لە هونەری ناسینەوەی دوگمەکانی کیبۆرد، بەپێی قسەی بروس شنیار کە بەرێوەبەرە لە کۆمپانیای (کاونتر باین ئینتەرنێت سیکوریتی) و خاوەنی کتێبی ((زانستە تەتبیقیەکانی رەمزدانان))، ئەو زانایە دەلێت کە لە بواری ئەمنیدا ئەوا شەیتان لە دەنگەکاندایە و بەو ڕێگە نوێیە توانیان کە ئەو دەنگانە دروست بکەن و بیان ناسنەوە.

بەلام ئەو ڕێگەیە نوێیە هەندێک کێشەی چارەسەرنەکراوی هەیە، بۆ نمونە

دوگمەی Shift و دوگمەی Backspace ناتوانری بەکاربێت، لەبەر ئەو ڕێگەیە تەنها تەرکیزی کردۆتە سەر ئەو نووسینانەی کە بە زمانی ئینگلیزی چاپکراون، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا دۆک تایگەر و بروس شنیار پێیان وایە کە ئەو کەموکورتیانە نابێتە هۆی بەکارنەهێنانی ئەو ڕێگەیە نوێیە و بڵاوبوونەوەی.

بروس شنیار دەڵێت کە تەنها مەسەلەی کاتە بۆ ئەوەی کە تاوانباران بتوانن ڕێگەیەکی وەکو ئەوە بدۆزنەوە و بەکاریبهێنن بۆ ئامانجی خۆیان، دۆک تایگەریش هەمان قسە دووبارە دەکاتەوە و دەڵێت کە ئەو ڕێگە نوێیە ڕێگەیەکی ئاسانە، بۆ نمونە توانرا کە سیستەمێک بەکاربێت کە سەرچاوەکەی کراوەیە و زانراوە بۆ ئاشکراکردنی دەنگی پیت و ووشەکان، ئەوە جگە لە مایکرۆفۆنی کۆمپیوتەر کە نرخەکەی تەنها ١٠ دۆلارە.

لەبەر ئەوەزاناکانی زانکۆی کالیفۆرنیا بڕیاریاندا کە ئەو ڕەمزە ئاشکرا نەکەن کە لە لێکۆلینەوەکەیان بەکارهاتووە، لەم بارەیەوە دۆک تایگەر دەڵێت ((من بڕوام وایە کە زەحمەت نیە خەلک بتوانن ئەو ڕەمزانە کۆبکەنەوە و بیان ناسنەوە، بەلام من ئامادەنیم کە ئەو کارەیان بۆ ئاسان بکەن)).

کەواتە بەکارهێنەرانی کۆمپیوتەر چی بکەن بەرامبەر ئەو خەتەرە نوێیە؟ دۆک تایگەر دەڵێت یەکێک لەو دەرسانەی کە لەو ڕێگەیە نوێیە فێری دەبین ئەوەیە کە تەنانەت پاسۆردی نەزانراویش دەکرێ ئاشکرا بکرێ، چونکە زاناکان توانیویانە لەسەدا نۆهەدی پاسەوۆردەکان کە لە پێنج پیت پێکهاتون ئاشکرا بکەن، دۆک تایگەر بەردەوام دەبێت و دەڵێت ( واباشترە کەچیتر پشت بە پاسەوۆرد نەبەسترێ ).

بۆ کەمکردنەوەی کاریگەری ئەو ڕێگەیە نوێیە، ئەو بەکارهێنەرانی کۆمپیوتەر دەتوانن دەنگی زۆر بەکاربهێنن وەکوو مۆسیقا و گۆرانی، لەم بارەیەوە (لی زوانگ) کە قوتابیەکی زانستی کۆمپیوتەرە لە زانکۆی بیرکلی دەڵێت (لە جێگەیەک کە دەنگ و هەرای زۆری تێدایە وەکو مۆسیقا و دەنگی ئینسانەکان، ئەوا زۆر زەحمەت دەبێت کە دەنگی دوگمەکانی کیبۆرد لە دەنگەکانیتر جودا بکرێنەوە).

# سایتێکی ئەنتەرنێت کە زمانی عەرەبی بەکاردەهێنێت لەسەر مۆبایل

**وەرگێڕانی: فائزە**

لەندن: ڕۆژنامەی (الشرق الاوسط)

کۆمپانیای دیوان بۆ بەرنامەدانان ئاشکرای کرد کە لەگەڵ کۆمپانیای (اوبن ویفز سیستمز) بۆندێکی مۆرکردوە بۆ ئەوەی کە تەکنولوجیای دەقێک کە بە چەند زمانێک بەکاردێت MULTILINGUAL BIDIRECTIONAL TEXT بۆ سەر سایتی (اوبن ویفز) زیاد بکرێ کە لەسەر ئەنتەرنێتی موبایل بەکاردێت.

ئەو تەکنۆلۆجیا نوێیە یارمەتی ئەوە دەدات کە هەموو ئەو زمانانەی کە لە ڕاستەوە بۆ چەپ دەنوسن وەکوو زمانی عەرەبی و فارسی و ئۆرد بتوانن کە بە موبایل سایتەکانی ئەنتەرنێت بکەنەوە و قسەی پێبکەن.



د. يحيى السلقان

ئەوەی کە پێویستە ئیشارەتی پێبدرێ ئەوەیە کە کۆمپانیای اوبن ویفز سیستمز هەلساوە بە زیادکردنی بزوێنەری نووسین TEXT ENGINE بۆ بەرنامەکەیان بۆ ئەوەی کاربکات لە چوارچێوەی خێرایی و توانای خەزن کردنی ئامێرە بچووکەکان، ئەو تەکنۆلوجیایە نوێیە دەکرێ لە لایەن کۆمەڵەی یونیکود بەکاربێت، هەروەها لەگەڵ توانای ئامێری مۆبایل دەگونجێت .

کۆمپانیای دیوان ئەو تەکنولوجیایە نوێیە لەگەڵ چاپی پێنجەمی (اوبن ویفز) دادەبەزێنێتە بازاڕ، عادل علاوی بەڕێوەبەری گەشەپێدان لە کۆمپانیای دیوان دەڵێت کە ئەو تەکنولوجیایە یارمەتی بەکارهێنەرانی موبایل دەدات لە وولاتانی ڕۆژهەلاتی ناوەڕاست کە هەموو ئەو زانیاریانەی کە پێویستیان پێ هەیە لە سەر تۆڕی ئەنتەرنێت بەدەستی بهێنن، کە ئەوەش دەبێتە هۆی گەشەکردنی ئابووری ناوچەکە .

بۆ زانیاری زیاتر تەماشای ئەو سایتانە بکە:

WWW.DIWAN.COM

WWW.OPENWAVE.COM

# ڕوونکردنەوەی بەرنامەی Ultra Video Splitter V3.2.0




ئامادەکردنی: عبدالقهار بلباس
qaharblbas@yahoo.com

ئـەم بەرنامەیە بەکاردێت بۆ بڕین و پارچە پارچە کردنی فایلی ڤدیۆیی قەبارە گەورەو بچووک، وە پشـتگیری زۆربەی شێوە ناسراوەکانی ڤدیۆ دەکات .

قەبارەی بەرنامەکەش ٥,١٦ میگا بایتە، بۆ دەستکەوتنیشی دەتوانن لە ئینتەر نێت لە ڕێگەی ئەم لینکەی خوارەوە داونلۆدی بکەن : HTTP://WWWAONE-SOFT.COM/ UVSPLITTER.EXE

زانیاریەکانـی تۆمارکردنیشـی بـەم شێوەی خوارەوەیە :

NAME: CRSKY
CODE : AE38A291-BE0E7048-F1B16FBC-C4800573-8F7A6951-B322EC33-1E3C5EE7-234F5DD9

بۆ زانیاری وەرگرتن لەسەر بەرنامەکە بە وردی سـەرنجی ئەم وێنەی خوارەوە بدە:

١- زیاد کردنی فایلی نوی
٢- دەست بکە بە بڕین / پاچەرکردن
٣- تۆمارکردنی بەرنامە
٤- زانیاری دەربارەی بەرنامە
٥- سایتی بەرنامەکە
٦-یارمەتی
٧- چونەدەر لە بەرنامە
٨- هەڵبژاردنی بڕینەکە
٩- هەڵبژاردنی پارچە کردن (ژمارەی بەشەکانی پارچەکردنەکە دیاری بکە)
١٠- شـوێنی سـەیڤ کردنی فایلەکە دیـاری بکە لـە دوای بڕینەکـە / پارچە کردنەکە
١١- شـێوازی سـەیڤکردنی فایلەکـە دیـاری بکـە لـەدوای برینەکـە / پارچە کردنەکە
١٢- پێوانەکانـی (قیاسـات) فایلەکـە دیاری بکە
١٣- نیشاندان / کارکردن
١٤- وەستاندن
١٥- سەرەتای بڕین
١٦- کۆتایی بڕین
١٧- سڕینەوە / چاککردن . بڕین

# هەوڵ و ڕۆڵی ناوەندە ڕۆشنبیریەکان بۆ فێرکردنی کۆمپیوتەرو ئەنتەرنێت

لەدوایی پرۆسەی ئازادی عێراق بەگشتی و کوردستان بەتایبەتی، توێژی گەنجان و منداڵ و خەڵکی بەگشتی ڕوویان لەفێربوونی کۆمپیوتەرو ئەنتەرنێت کرد. بۆ بەرە وپێش بردنی کۆمەڵگای کوردەواری بۆوەرگرتنی زانست و زانیاریە نوێیەکانی ئەم سەردەمە .خەڵکی بۆفێربوون زیاتر ڕویان لەو ناوەندە ڕۆشنبیریانە کرد کە بۆکار و چالاکی لاوان دامەزراون .ئایا تاچەند ئەم ناوەندو بنکە ڕۆشنبیریانە بۆفێرکردنی لاوان ڕۆڵی خۆیان بینیوە ؟ ئایا تاچەند هەوڵیان داوە لاوان بۆبواری کۆمپیوتەر و ئەنتەرنێت ڕابکێشن ؟ ئایائامانجیان لەکردنەوەی ئەم خولانەی کۆمپیوتەر چیە ؟ تاچەند ئاسانکاریان کردوە بۆتوێژی لاوان ؟ بۆئاشنا بوون چەندین لەبەرپرسان و کارمەندانی بنکەو ناوەندە ڕۆشنبیریەکانمان هێنا دوان .

**ڕیپۆرتاژو فۆتۆ: ڕێناز ئەردەلان بەکر**



**سەرەتا بەڕێز خاتوو شیرن حەمە صالح بەرپرسی ناوەندی چاودێری منداڵانی کەرکوک دەلێت :**

ئێمە لەناوەندی چاودێری منداڵانی کەرکوک توانیومانە نزیکەی (٣٣٢) کەس کەزۆربەیان منداڵن فێری سەرەتاکانی بەکارهێنانی کۆمپیوتەریان بکەین کەبەشێوەی کۆرس بەڕێوە دەچوو،بەهاوکاری ڕێکخراوی دیاکونیایی سویدی کەوا کۆمپیوتەرەکانیان پێ بەخشیوین .لەبەر ئەوەی شاری کەرکوک لەدوایی ڕزگارکردنەوە خەڵکی زیاتر ئاشنای کۆمپیوتەر بوون، بۆیە نیازمان وایە بەردەوام بین لەکردنەوەی خولی کۆمپیوتەر بۆمنداڵان و بۆئارەزوومەندانی فێربوونی کۆمپیوتەر .

**بەڕێز محەمەد حسێن ئەحمەد بەڕێوەبەری ڕۆشنبیری منداڵان بەم شێوەیە هاتە دووان:**



ئەم بەڕێوە بەرایەتیە یەکێکە لەبەڕێوەبەرایەتیەکانی سەر بەبەڕێوە بەرایەتی گشتی ڕۆشنبیری و هونەر لەوەزارەتی ڕۆشنبیری ئێمە بەشێکی فراوانی کۆمپیوتەرمان هەیە کەبەشەکەمان لە (١٠) کۆمپیوتەر پێک دێت ساڵانە ئێمە چەندین خول دەکەینەوە ئەم خولانە مامۆستای چاک و شارەزایان هەیە بۆفێربوونی منداڵان، چونکە فێربونی منداڵان جیاوازە مامۆستای لێهاتوی دەوێ . کاتێک ژمارەی قوتابیان زۆربێت دەیکەن بەدوو بەش بەیانیان و ئێواران .بۆیە بەتایبەتی منداڵ ئەگەر لەمنداڵیەوە خۆشەویستی ئەم زانستەیان لە دڵ بڕوێنین بۆپاشە ڕۆژ باشە، بەتایبەتی قوتابیانی سەرەتایی کاتێک خولێک تەواو دەکەن خولێکی پێشکەوتو تریان بۆدەکەینەوە بە پێ پڕۆگرامێکی دارێژراو .

**بەڕێز محەمەد عەلی عوزێری سەرۆکی ناوەندی ڕۆشنبیری قەڵات بەم شێوەیە ئاماژەی بەووتەکانی کرد:**

بەشی کۆمپیوتەر لەناوەندەکەی ئێمە لە دوو بەش پێک دێت بەشی یەکەمیان



کە لەدوو کۆمپیوتەر پێک دێت بەردەوام لەبەردەستی هونەرمەندان و شاعیرو نوسەرانە کە کارو چالاکیەکانی خۆیانی پێ ئەنجام دەدەن، بەشی دووەم کردنەوەی خولە تاکو ئێستا دوو خولمان کردۆتەوە ئەم دوو خولەش بۆ ماوەی دوومانگ بوو لەهەفتەدا بۆماوەی سێ ڕۆژ خولەکە ئەنجام دەدرا . لەخولەکەش زیاتر تیشک دەخرایە سەر فێربوونی سەرەتاکانی بەکارهێنانی کۆمپیوتەر بایەخێکی تایبەتیشمان بە (WORD) داوە. کۆمپیوتەر ئەمڕۆ زمانی سەردەمە پێویستە ئێمەی کورد لێ یی بێ ئاگانەبین، پڕۆژەی داهاتووشمان ئەوە یە چەند خولێکی تر لەناو هەولێر بکەینەوە تایبەت بێ بەکۆمپیوتەر بۆتوێژی گەنجان .

**بەڕێز سۆران مارف کەریم سەرۆکی ناوەندی ڕۆشنبیری شار لەسلێمانی دەڵێت:**



ئێمە وەک سەنتەری ڕۆشنبیری شار لەخزمەت بزاڤی ڕۆشنبیری گەنجان کاردەکەین،ئەوەی شایەنی باسە ئێمە بۆماوەی چوار مانگە دەستمان بەکارو چالاکی خۆمان کردوە لەسنوری ناوچەی سلێمانی .خولی کۆمپیوتەر لای ئێمە تاکو ئێستا دەست بەکار نەبووە لەبەر ئەوەی ماوەیەکی کەمە ئەم سەنتەرە دامەزراوە بودجەی بەپێ پێویست نەبوە . بەڵام دوای ئەوەی بانگ هێشت کراین بۆئەنجومەنی وەزیران لەلایەن نوێنەری بەڕێز نێچیرڤان بارزانی داوامان کرد چەند کۆمپیوتەرێکمان بۆدابین بکەن، لەبەر ئەوەی کۆمپیوتەر یەکێکە لە پێویستیەکان کە هەموو تاکێکی گەنج پێویستی پێیەتی .لەدوای دابین کردنی کۆمپیوتەر بۆمان بەنیازین لەئایندەیەکی نزیک خول بۆقوتابیان و بەژداربوان بکەینەوە،بۆئەم مەبەستە ژمارەیەک قوتابی بۆ ئەم خولەخۆیان ناو نووس کردوە .لەسەر ئێمەش پێویستە وابۆگەنج پیشان بدەین کە پێویستە گەنجی کورد بەدوای چەکی سەردەمدا بگەڕێن کەیەکێک لەو چەکانە



تەکنە لۆژیایە کەکۆمپیوتەریش یەکێکە لەو تەکنەلۆژیایەی سەردەم .

**بەڕێز مامۆستا هۆشەنگ مامۆستایی کۆمپیوتەر لەناوەندی ڕۆژ گوتی :**



خولەکانی کۆمپیوتەر لەناوەندی ڕۆژ سیستەمی (WINDWOS- WORD) ە ئەوانی دێنە ئێرە بۆخولەکان شارەزایی باشیان لەکۆمپیوتەر نیە زیاتر ئەوانی دێن فەرمانبەرن یاخود قوتابی کۆلیژن. کردنەوەی ئەم خولانەی کۆمپیوتەر من زۆر بەگرنگ و پێویست دەزانم،چونکە ئەوانەی بۆئێرە دێن خولیای فێربونی کۆمپیوتەرن ئێمەش نیازمان وایە قوتابیان بەباشترین ئاست دەرچن لەو خولانەی کەبۆیان دەکەینەوە بڕوانامەشیان پێ دەبەخشین .

**بەڕێز خاتوو لانە زاهیر عومەر کارمەندی بنکەی ڕۆژ دەڵێت :**

خولەکان لەم بنکەیە زۆر بە سەرکەوتوی بەڕێوە دەچن بەتایبەتی خولی کۆمپیوتەر ئەوانی دێنە ئێرە بەشێوەیەکی زۆر باش سود لەخولەکە وەردەگرن .ئێستاش خولی کۆمپیوتەر زۆرباوە خەڵکەکەش زیاتر ڕوی تێ دەکات .چەندی دام و دەزگای نوێ بکرێتەوە هەنگاو بنێ بۆ فێرکردنی لاوان ئەوا بۆ ئێمە باشترە بەرهەمێکی چاکی بەدواوەیە .

**بەڕێز شێروان هادی ژمێریار لە ناوەندی ڕوناکبیری ڕۆژ گوتی:**



ئێمە لێرە زۆر گرنگیمان بەکۆمپیوتەر داوە ئەوکاتەی ئێمە لێرە خولی کۆمپیوتەرمان کردەوە کۆمپیوتەر بەشتێکی بازرگانی دادەنرا. ڕێکخراوی دیاکۆنیای سویدی کەل و پەلێکی زۆری کۆمپیوتەری بۆدابین کردین .یەکەم خول کەکردمانەوە بۆ ماوەی مانگێک بوو،چەندین مامۆستاش خولیان لێرە کردۆتەوە چەند پرۆگرامێک گوتراوەتەوە لەوانە (WINDWOS-WORD-POWER POINT) کەبەژدار بوان سودیان لێ وەرگرتوە .

**بەڕێز هەوراز جەلال مامۆستای بەشی کۆمپیوتەر لە سەنتەری میدیای لاوان بەپێ ی وتەکانی دەڵێت:**



سەبارەت بە سەنتەری ئێمە ئێستا خولێکی (١٥) ڕۆژیمان کردۆتەوە بۆ نزیکەی (٢٦) قوتابی،لەبەر ئەوەی ئێستا کاتی خوێندن کاتەکەمان ڕێک خستوە بۆ ئەوەی قوتابیان بتوانن بەژداربن بەرنامەکانیش بریتین لە (WORD- WINDWOS) چونکە ئەوکەسانەی کەبەژدارن لێرە هیچ شتێک لەبارەی کۆمپیوتەر نازانن .بۆ هەر قوتابیەکیش لەماوەی خولەکە بڕی (١٠٠٠٠) دیناری لێ وەردەگیرێ کەنرخەکەی زۆر جیایە لەگەڵ بازار نرخی ئەم دوو بەرنامەیە بڕی (٤٥٠٠٠ ) دینارە،هەروەها لەسەنتەر بەشی ئەنتەرنێتیشمان هەیە کە قوتابیان و گەنجان دەتوانن سودی لێ وەرگرن کە نرخی یەک کاتژمێر لێرە بڕی (٧٥٠) دینارە .خولەکانیش لێرە بەگوێرەی شارەزای بەژداربوان دەبێت تاچەند ئاستی هەیە چ بەرنامەیەک داوادەکات . ئێمە لێرە هەوڵ دەدەین بۆ دەرچوانی خولی کۆمپیوتەر بڕوانامەی ڕەسمی دروست بکەین کەباوەڕپێکراو بێت لەلایەن وەزارەتی پەروەردە ببەخشین بەدەرچوان، تاکو ئەوان کارەکانی خۆیانی پێ جێ بەجێ بکەن لەکاتی دامەزراندن لەفەرمانگەکان .

**بەڕێز لەنجە عبدللە بەڕێوەبەری سەنتەری میدیای لاوان بۆ ڕۆشنبیری و هونەرو ڕاگەیاندن بەم شێوەیە بۆچونی خۆی دەربڕی:**





لەگەڵ پێشکەوتنی تەکنەلۆژیا لە هەموو جیهاندا بەبۆچونی من شتێکی پێویستە کە هەموو کەسێک لە هەر شوێنێک بێت پێویستە کۆمپیوتەر بزانێ،ئەگەر لەماڵیش نەبێ لە ڕێگای سەنتەرە ڕۆشنبیریەکانی گەنجان بتوانێ ممارەسەی فێربونی کۆمپیوتەر بکات،بەبۆچونی من گواستنەوەی زانیاری و ڕۆشنبیریەکان بەڕێگای کۆمپیوتەر ئاسانترە لەوەی کەتۆ کتێب بخوێنیتەوە . بۆیە ئێمە پێمان باش بوو لەم شوێنە کەتاڕادەیەک گەرەکێکی میلیە لەوانەیە سەنتەری تێدا نەبێت لەگەڵ ئەوەش ژمارەیەک لە قوتابی و فەرمانبەرێکی زۆری تێدایە، خولی کۆمپیوتەرو ئەنتەرنێتیان بۆبکەینەوە بۆئەوەی بەشێوەیەکی ڕاستەوخۆ سودی لێ وەرگرن .






# چەند کورتکراوەیەکی کیبۆرد تایبەت بە ئەنتەرنێت

**شۆخان جلال – سلێمانی**

لەکوردستان و لە عیراقیش بە گشتی تا ئەو کاتە سەنتەرەکان جمەیان دێت لە خەڵک وهەوادارانی ئەنتەرنێت بەتایبەتی قوتابیان کە زۆر سەردانی سەنتەرەکانی ئەنتەرنێت دەکەن هەموو سەنتەرەکانیش بەکات مامەڵە دەکەن . وەک لای هەمومان ئاشکرایە کە کات چەند پێویستە کاتێک دەمانەوێ بە دوای زانیاریدا بگەڕێین یان ئەوتا سەردانی ماڵپەرەکان دەکەین و هەندێ جار دەمانەوێ ماڵپەرێک دابەزێنین یان ئەوتا لەکردنەوەی پەشیمان بین، یان هەر کردارێکی تر بێت ئەوا دەبێت دەست بدەینە ماوس و ئەم کردارە جێبەجێ بکەین ئەمەش کات بەفیرۆ دەدات جا بۆ ئەوەی ئەم کردارانە بەخێرایی بەجێ بگەینین ئەوا یەکسەر لەسەر کیبۆرد هەندێک لەم کردارانە کورت کراونەتەوە بۆنمونە ئەگەر ویستت کە:

١- ماڵپەرێک دابەزێنێت ئەوا پەنجە بنێ بە (F5)

٢- لە دابەزاندن پەشیمان بویتەوە یان لەکردنەوەی ماڵپەرێک پەشیمان بویت ئەوا پەنجە بنێ (ESC)

٣- بگەڕێیتەوە سەرەتای ماڵپەرەکە ئەوا (HOME)

٤- گەرانەوە بۆ کۆتایی ماڵپەرەکە ئەوا پەنجە بنێ (END)

٥- بۆ جولاندنی لاپەرەکە لەکاتی خوێندنەوەی یان سەیرکردنی پەنجە بنێ (PAGE DOWN OR SPACE)

٦- بەهەمان شێوە بۆ گەرانەوە بۆ سەرەوە پەنجە بنێ (PAGE UP OR SHIFT)

٧- ئەگەر ویستت بگەڕێیەوە بۆ ماڵپەری پێشوو کە سەردانت کردبوو پەنجە بنێ (ALT + LEFT ARROW)

٨- بۆ کردنەوەی (FAVORITES) ڕێکخستنی ماڵپەر پەنجە بنێ (CTRL + B)

٩- بۆ ئەوەی ماڵپەرێک بخەیتە ناو (FAVORITES) پەنجە بنێ (CTRL + D)

١٠- بۆ کردنەوەی هیستۆری ناو کۆمپیوتەرەکەت پەنجە بنێ (CTRL + H)

١١- بۆ کردنەوەی ماڵپەرێکی نوێ پەنجە بنێ (CTRL + L)

١٢- ئەگەر ویستت ڕوپەری ماڵپەرەکە پرێنت بکەیت پەنجە بنێ (CTRL + P)

١٣- ئەگەر ویستت ئەم ماڵپەرە دابخەیت پەنجە بنێ (CTRL + W)

١٤- ئەگەر ویستت خەزنی بکەیت پەنجە بنێ (CTRL + S)

# pop-up stopper pro 2.0

# دیارنەخستنی ڕیکلام لە سایتەکان




وێنەی (١)

## ئا: بژار ڕەفیق

**POP-UP STOPPER** بەرنامەیەکە هەڵئەستێ بە ڕاگرتن و بەدیارنەخستنی ئەو ڕیکلامانەی کە بەدیاردەکەون لە سایتی سەرەکی، وە کاردەکات لەگەڵ بەرنامەی **INTERNET EXPLORER** بە شێوەی لیستی ئامێرکاری ( **TOOL BAR**)، وە بەرنامەیەکی ئاسانە بۆ بەکارهێنان، وە پێویستی بەهیچ شتێک نییە بۆ دابەزاندنی، وە لەڕێیەوە دەتوانین قەدەغەی هەر سایتێک بکەین بۆ وەدیارنەخستنی هەر ڕیکلامێک، یاخود سەربەست کردنی هەر سایتێک بە پیشاندانی ڕیکلام، وە لەکاتێکدا کە قەدەغەی سایتێک دەکەین بۆ پیشان نەدانی ڕیکلام ئەوا گوێمان لە دەنگێک دەبێت، وە ئەتوانین لە هەڵبژاردنەکانی بەرنامە هەر دەنگێک حەزمان لێی بێت دای بنێین .

قەبارەی بەرنامەکە 386**KB** وە دەتوانین دای بەزێنین لە سایتی **HTTP://WWW.PANICWARE.COM/DOWNLOADS/ POPUPSTOPPERPRO.EXE**

پاش دامەزراندنی بەرنامەکە بە سەرکەوتوویی، ئەوا بەرنامەکە هەڵئەستێ بە کردنەوەی ئێکسبلۆرەر بۆ نیشاندانی زانیاری لەسەر بەرنامەکە، وە تێبینی دەکەین شریتێکی کارپێکردنی ئەم بەرنامەیە هاتۆتە ناو ئێکسبلۆرەر، وەک لەم وێنەی (وێنەی ژمارە ١) دیارە، ئەگەر ئەم لیستە بەدیارنەکەوت ئەوا بڕۆ بۆ بەدیارخستنی لە VIEW پاشان **TOOL BARS** وە دوایی **PANICWARE POP-UP STOPPER**، وە ئەم دوگمانە لەسەر لیستەکەن .

**١. ئەم دوگمەیە بۆ بەدیارخستن و شاردنەوەی ڕیکلامەکانە.**

**٢. ئەم دوگمەیە بۆ وەکارخستن و لەکارکەوتنی دەنگە لەکاتی قەدەغەکردنی ڕیکلام لە سایتەکان .**

**٣. زیادکردنی ئەو سایتەی ئێستا بۆ لیستی ئەو سایتانەی کە ڕێ پێدراون بۆ وەدەرخستنی ڕیکلامەکانیان .**

**٤. کردنەوەی ئەو فۆڵدەرەی کە کۆتا جار مەلەفمان تیا خەزن کردووە لە ئینتەرنێت .**

٥. کۆپی کردنی ناونیشانی ئێستای ئەم سایتە ( کە نووسراوە لە لیستی **ADDRESS**)، بۆ پارێزەری ( **CLIPBOARD**)، بەمەبەستی دانانەوەی لەهەر شوێنێک بەهۆی کلیکی **CTRL+V**.

٦. هەڵبژاردنە تایبەتەکانی بەرنامە، کاتێک کلیکی لەسەر دەکەین فۆرمێک بەدیاردەکەوێت، وە ئەوەی بەلامانەوە گرنگە هەڵبژاردنی **PREFERENCES**، بە کلیک کردنی شاشەیەکمان بۆ دەکرێتەوە (وێنەی ژمارە ٢)، وە لەم بەشانە پێکهاتووە .

* بەشی GENERAL دوو هەڵبژاردەی تیایە، **LOCAL TOOLBAR BELOW ADDRESS BAR IN INTERNET EXPLORER**

+++ واتە هەڵدەستێ بە چەسپاندنی شوێنی لیستی بەرنامەکە لە ئینتەرنێت ئێکسپلورەر، هەتا وەکو نەتوانین بیجوڵێنین بۆ شوێنێکی تر، وە بەلابردنی نیشانەی ڕاستە ئەوا ئەتوانین لیستەکە بجوڵێنین، ئەویش بە کلیک کردن لەسەر ناونیشانی لیستی POP-UP STOPPER وە جوڵاندنی بۆ ئەو شوێنە.

SHOW PROGRAM TITLE ON THE TOOLBAR +++ واتـە بەدیارخسـتن و شـاردنەوەی ناونیشـانی بەرنامـەی (POP-UP STOPPER) لەسـەر لیسـتەکە، وە بەنیسـبەت دوگمـەی CUSTOMIZE TOOLBAR ئەویـش بۆ ئیزافـە کردن و لابردنی دوگمەکانی سەر لیستی بەرنامەکەن .

* وە بەشـی POP-UP وەکو لە وێنـەی ژمارە دوودا دیارە لەم فەرمانانە پێکهاتووە.

١. دانـان و لابردنـی دەنگـی ئاگادارکردنـەوە لـە کاتـی قەدەغەکردنی ڕیکلام لە سایتەکان .

٢. هەڵبژاردنـی مەلەفـی دەنـگ کـە دەمانـەوێ دابنێین بۆ ئاگادارکرنەوە لەکاتی دیارنەخستنی ڕیکلامەکان .

٣. تاقی کردنەوەی مەلەفی دەنگەکە .

٤. دەست بەسەراگرتنی تەواو بەپێشان نەدانی چوارچێوەی کارا .

٥. لابردنی ئەو سـایتەی کەوا پێشـتر ئیزافـەت کردبوو بۆ ئەوەی قەدەغە نەکرێ لە پیشاندانی ڕیکلامەکان .

٦. لابـردن و دانانـی تۆمارکردنـی ئامـارەکان لەسـەر ئەو شاشانەی کە قەدەغە کراون .

٧. پیشان دانی ئامارەکان .




وێنەی (٢)




# دروست کردنی سایتێکی نموونەیی لە سەر ئەنتەرنێت

**محمد سیامند تاهر**
mohammed990mail@yahoo.com

لەسەر تۆری ئەنتەرنێتدا جۆرەها سایتی بەربڵاو و جیاجیا هەن کـە هەرجۆرێکیان جۆرە دیزاین و بانەری تایبەتی خۆی هەیـە و تەنانەت لە نێوان سایتەکانیشـدا پێش برکێیەکی یەک جار زۆر هەیە لە پێشکەوتنی دیزاین و بانەڕ و بابەتی سایتێک لە سـایتێکی تر، زۆر جار سـەردانی ئەم سـایتانە دەکەیت و دەپرسیت : ئایا ئەم جۆرە سایت و ماڵپەرانە چۆن

بـەم شـێوە ڕازاندراونەتەوە و جۆرەها وێنـەی جوڵاوی لە ناودا بڵاو کراوەتەوە و بووەتە هۆی ڕەونەق کردنی سایتەکە؟ لە ڕاسـتیدا و بە پێچەوانەوە دروسـت کردنی سـایت کارێکی زۆر ئاسـانە بـەڵام پێویسـتی بەکەسـێکی لێهاتـوو هەیە لەم بـووارەدا لێـرەدا بەکورتی ڕێگاکانی دروسـت کردنی سـایت ڕوون دەکەمەوە:

گرتنی شوێن و ڕووبەرێکی فراوان بۆ سایتەکەت:

سەرەتا پێش دروست کردنی سایتەکەت پێویستە جێگایەکی تایبەت بەسایتەکەت لە سەر ئەنتەرنێتدا بگریت لێرەدا چەندەها سایت هەن کە جێگات بە خۆڕایی پێدەبەخشن لەوانە،

سـایتی (FREE SERVERS) ئـەم سـایتە نزیکـەی (20MB) ڕووبەرێکـی بە خۆڕاییت دەداتێ ئەویش بە دانانی بانەڕێک لە سەرووی سایتەکەتەوە .

سـایتی (GROSSWINDS) ڕووبەرێکـی دیـاری نەکـراوت دەداتێـت بە رامبـەر بەدانانی بانەرێکی بچووک لە سـەرووی سایتەکەتەوە.

بەهەمان شێوە ئەم سایتانەش : 150M، TRIPOD، گەلێک سایتی تر .

دیزاینی (تصمیم) سایت:

گرینگ ترین بەشی ئامادەکردنی سایت دیزاینی (تصمیم) سایتە کەبەچەند شێوەیەک دروست دەکرێت، بەرنامەی دروست کردنی سایت زۆرن و بەڵام گرنگترینیان و ئاسانترینیان بەرنامای (FRONT PAGE) هەروەها دەتوانیت لە ڕێگەی زمانی (HTML) ەوە سایتەکەت ئامادە بکەیت ئەویش زمانێکی ئاسانە و بەزووترین کات فێری دەبیت ئەگەر هاتوو سەردانی ئە سایتانەت کرد.

سایتی HP بەعەرەبی، سایتی دکتور نێت.

<u>دانانی چەند وێنەیەکی جوڵاو بۆ سایتەکەت :</u>

دوای ئامادە کردنی سایتەکەت بە هۆی بەرنامەی (FRONT PAGE) یا زمانی (HTML) دانانی چەند وێنەیەکی جوڵاو سایتەکەت ڕازاوەتر دەکات، بۆ دروست کردنی وێنەی جوڵاو ئەم بەرنامانە بەکار بهێنە، FLASH MX، PINT SHOP PRO، PHOTO SHOP، GIF ANIMATION و گەلێک بەرنامەی تر .

<u>لیستی میوانان :</u>

زیاد کردنی ئەم لیستە پێویستە بۆ سایتەکەت لەبەر ئەوەی ئەم جۆرە لیستە ژمارەی ئەو کەسانەت پێڕادەگەێنێت کە سەردانی سایتەکەت دەکەن، بۆ دانانی ئەم لیستە بەخۆرایی لە سایتەکەت سوود لەم سایتانە وەر بگرە :

. THE COUNTER، SITEFLOW، ULTIMATE COUNTER

<u>کورت کردنەوەی ناونیشان :</u>

بۆ کورت کردنی ناونیشانی سایت ئەگەر هاتوو درێژو لەبەر کردنی گران بوو سوود لەم سایتانە وەربگرە،

HTTP://I.AM/USERNAME، HTTP://HELLO.TO/USERNAME، HTTP://FLY.TO/USERNAME .

<u>بڵاو کردنەوەی سایتەکە لە ئەنتەرنێت :</u>

دوای ئامادە کردنی سایتەکەت و بەشی کۆتایی کارەکانت، بڵاو کردنەوەی سایتەکەت لە ئەنتەرنێتدا پێویستە دووبارە سەردانی ئەو سایتە بکەیت کە ڕووبەرێکی دیاری کراوی پێ بەخشی بوویت بەخۆرایی، سایتی FREE SERVERS بۆ نموونە یەکێکە لەو سایتە بەناوبانگانە کە لە ڕێگەی BROWSER ە پێشکەوتووەکانی یەوە دەتوانیت سایتەکەت ڕەوانەی ئەنتەرنێت بکەیت.

## ئاگاداری

بۆ هەموو ئەو بەڕێزانەی کە توانای نووسینیان هەیە لە بواری کۆمپیوتەر و ئەنتەرنێت ئەگەر توانای نووسینی بابەتیان هەیە لەم بوارەدا دەتوانن بەشداری بکەن لە گۆڤاری کۆمپیوتەر و دەتوانن سەردانمان بکەن یان بابەتەکانیان بنێرن بۆ ئەم ناونیشانە : هەرێمی کوردستانی عێراق / یەکەی کۆمپیوتەر لە دیوانی وەزارەتی ڕۆشنبیری جادەی شەست مەتری نزیک هۆڵی زەرد یان پەیوەندی بکەن بە سەرنووسەرەوە بەم ناونیشانە مەڵبەندی کۆمپیوتەری ئاراس هەولێر بەرامبەر قەڵا باڵەخانەی قەیسەری حاجی یەحیا نهۆمی دووەم یان بە ژمارە تەلەفۆنی 2232721 مۆبایل 07504618045 یان پۆستی ئەلکترۆنی

EMAIL : COMPUTER_MAGAZINE_2005@YAHOO.COM

EMAIL : ARAS_CO_CENTER@YAHOO.COM

تێبینی :

*هەر بابەتێک بڵاو بکرێتەوە پاداشتی پێ دەدرێت .

* هەر بابەتێک لە شوێنێک یان گۆڤارێکی تری کوردی بڵاوکرابێتەوە ئێمە بڵاوی ناکەینەوە.

* بابەتەکانتان ئەگەر نەشیا بۆ بڵاوکردنەوە ئەوا ناگەڕێتەوە.

*هەر کەسێک بابەت ئەنێری بۆ بڵاو کردنەوە با بابەتەکەی لەسەر فلۆپی دیسک یان فلاش میموری بێت و وێنەی ڕوونکەرەوەکان بەجیا لە نێو فولدەرێک دا بێت و بابەتەکەی بە بەرنامەی MICROSOFT WORD بنووسێت.




# لە ماڵپەڕێک تەواوی سایتە عیراقیەکان سەردان بکە

ماڵپەری HTTP://WWW.IRAQIDEWAN.NETLINKS هەڵساوە بە لینک کردنی تەواوی ماڵپەرەکانی عیراقی زۆر بە ستایلێکی جوان دیزانی کێشاوەو لە یەکی جیاکردونەتەوە لەهەمان کاتدا تەواوی ماڵپەرەکانی بەسەر شەش بەشدا دابەش کردون کەبریتین لە (وەزارەتەکان و دامەزراوە حکومیەکان، راگەیاندنی عیراقی، بەشی هونەرو مۆسیقا، هۆزو گروپە عیراقیە جۆر بەجۆرەکان، ماڵپەرە سیاسی و حزبیەکان، جیا لەمانەش، جگە لەمەش ئەم ماڵپەرە چەندان خزمەت گوزاری تر پێشکەش بە میوانانی دەکات.

# ماڵپەڕێک بۆ نمایشکردنی زیاتر لە ١٠٠٠ کەناڵی ئاسمانی

بێستون عمر

کار ئاسـانی و خزمـەت گوزاریەکانی ئەنتەرنێـت گەیشـتە ئـەو رادەی کـە پەخشـی کەناڵەکانـی ئاسـمانیش بکات ئێسـتا لە ناو تۆرەکانـی ئەنتەرنێت جگە لە خزمەت گوزاری پۆسـتی ئەلیکترۆنی و پەرەکانی وێـب و فاکس و تەلەفون و هـەواڵ و بەم دواییەش خزمەت گوزاری وێب کام واتە لـەدورەوە چاودێریکردن بەکامێرای ڤیدیۆیی لە رێگای ئەنتەرنێت، ئێسـتا تـۆ دەتوانیـت زیاتـر لـە ١١٥٠ کەناڵی ئاسمانی جیهانی ناسراو لەرێگای ئەنتەرنێت ببینیـت، بەهەرزانترین نرخ و بە ئاسانترین شێوە.

کەرەستەی پێویست تەنها پێویستت بە یەکێک لە بەرنامەکانی نمایشـی ڤیدیۆییە یـان میدیـا پلیەر یـان ریـەل وەن ئێتر لەرێـگای کردنـەوەی ماڵپەرەکـەی ئەو وڵاتـە لـە کەتەلۆگەکـە هەڵدەبژێریت و کلێک لەسـەر ژمارەکە دەکەیت بۆ نمونە کەناڵی ئاسمانی کوردستان K٢٥٠ کلیک دەکەیـت و چـاوەروان دەکەیت تا تەواو دادەبەزێـت ئینجـا کەناڵەکـە دەسـت بە پەخش دەکات، وینەی ژمارە (١) روکاری ماڵپەرەکەیە .

وێنەی (١)

یارمەتی دەرێک لە ماسنجەر کە پێت دەڵێت چەند نامەت بۆ هاتوە و چ کاتێک هاتوون وە چەند کەس لەسەر توری ماسنجەرن ئەمەش دەبێتە هۆی یارمەتیدەری سەرەکی تۆ کاتێکی کەمت لەبەردەستە لەسەر خەت دەتەوێ بزانی نامەکانی بۆت هاتون کاتەکانی نامەکان دیاری کراون هەروەها جگە لەم کارە چەند توانایەکی بەرزی هەیە دەتوانیت سودی لێ وەربگری ئەگەر بێت و کار بەو بەرنامەیە بکەیت ئەو کاتە دەبینی کە چۆن ئاسانکاریت بۆدەکات لە ماسنجەر مەرجەکانی ئەو بەرنامەیە دەبێت MSN HOTMAIL تان هەبێت.

دووەم ناوی خۆت دەنووسیت و ژمارەی نهێنییەکەت دەنووسیت بەلام بێ ئەوەی HOTMAIL@.COM بنوسیت. (وێنە١)

وەک وێنە ٢ دیاری کردوە ئەوانەی کۆمپیوتەرەکانیان بەرەنگی شین دیارن ئەوانە لەسەر هێڵن وە ئەوانەی رەنگی

وێنەی (٣)

وێنەی (٢)




وێنەی (٤)

کۆمپیوتەرەکانیان سوورن ئەوانەن کەلەسەر هێڵ نین.
دەتوانی ناوی ئەو کەسانەی کەلەسەر هێڵن ئاد بکەیت وە دەتوانیت ناوی خۆت کەلەژێرەوە لەبۆشاییەک نووسراوە دیارو نادیاری بکەیت واتا تۆ لەسەر هێڵی دەتوانی ناوی خۆت لادەی کەس نەزانێت تۆ لەسەر هێڵی
کلیک لەسەر BY E-MAIL ADDRESS پاشان NEXT (وێنە٣).
ئینجا نامەیەک بۆ ئەو کەسە دەچێت کەتۆ ئادی دەکەیت لەلای خۆت ئەویش بەلێدانی ئۆکەی لەلای تۆ ئاد دەبێت بەمەرجێک




وێنەی (٦)




وێنەی (٥)

دەبێت ئەوکەسەی لەلای تۆ ئاد دەبێت ئەو بەرنامەیە بەکار بێنێت (وێنە٤).
پاش ئەنجام دانی ئەوکارانە ناوی تۆ دیار دەبێت لەلایەنی کەسی بەرامبەر (وێنە٥).
ئەگەر بتەوێ لەگەڵ هەر برادەرێکت قسەبکەیت دوو کلیکی لەسەر ناوەکەی دەکەیت لیستەکە دێتە پێشت بەم شێوەیە (وێنە٦).
هەر وەها بۆ گۆرینی قەبارەی نووسینەکەت سەیری (وێنە٧) بکە.




وێنەی (٧)

# یاهوو پرسیار و وەڵام
# Yahoo! Answers

Finance Music Travel YAHOO! Mail My Yahoo! Messen

Select Search Category: Web | Images | Video | Directory | Local | News | Products

Search the Web: [Yahoo! Search] · Advanc · My Web

Yahoo! Search - When you just want to search, use search.yahoo.com. Try it now.

Check your mail status: Sign In    Free mail: Sign Up

Autos, Chat, Finance, Games, GeoCities, Groups, Health
Horoscopes, HotJobs, Kids, Mail, Maps, Messenger, Mobile
Movies, Music, My Yahoo!, News, People Search, Personals, Photos
Real Estate, Shopping, Sports, Travel, TV, Yellow Pages
All Y! Services...

LOWE'S
Inspiration lives at Lowe
Outdoor fun starts here >>
Get inspired by Lowe's

In the News    5:47am, Tue
- Senators avoid battle over filibusters
- Deadly car bomb explodes near Iraq sch
- First Lady wraps up Mideast tour
- Graner may testify at Abu Ghraib hearin
- Brazil losing fight to save the Amazon
- Hackers hold files hostage, extort ranso
- Travelers take to workouts at airport gyn
- NBA Playoffs · MLB · French Open · So

News · Popular · Sports · Stocks

LOWE'S
Enjoy the outdoors.
From your backyard.

Weather
Enter City or U.S. Zip Code [Go]
Save location on this page

Yahoo! Small Business
Web Hosting, Sell Online, Domain Names, Search Marketing

Yahoo! Featured Services
Personal Website, Personals, Weekend Plans, HotJobs

کۆمپانیای یاهوو خۆی ئامادە دەکات بۆ خستنە ڕووی خزمەت گوزاریەکی نوێ کە تیایدا چەند پسپۆڕێکی تەرخان کردوە لە هەموو بوارەکاندا بۆ وەڵامدانەوەی ئەو پرسیارانەی کە لە ڕێگای ئەم گۆشەیەوە بۆیان دەچێت کە ئەمەش ناونیشانی ئەو گۆشە خزمەت گوزاریەیە YAHOO! ANSWERS شایانی باسە ئەو پرسیارانەی کە بۆ ئە و ناونیشانە دەچێت لەگەل وەڵامی پرسیارەکاندا پێرست دەکرێن بە شێوەیەکی ڕێک و پێک و لە گۆشەیەکی سایتەکەدا دادەنرێن تا بەشدار بووی ئەو گۆشە خزمەتگوزاریە بە شێوەیەکی ئاسان بتوانن ڕاستە و خۆ وەڵامی پرسیارەکانیان لەو گۆشەیەدا بدۆزنەوە بێ ئەوەی دوا بکەون یان چاوەڕوان بکەن.

## سیمێنس و تەلەفۆنێک بۆ بەستنەوەی تۆڕی ئەنتەرنێت بۆ ماڵەکان دژی دزیو سیخوری

بەم دوایە شـــەریکەی سیمێنس جۆرە تەلەفۆنێکی هێنا بەرهەم بەناوی (Gigaset SX550 dsl/cable) کەدەبەســـترێتەوە بە تۆری ئەنتەرنێـت هەروەهـا ئەم تەلەفۆنە بەتاکـە ئامێر دادەنرێت بۆ هێنانی تۆری ئەنتەرنێت بەخێراترین کات بۆنا وماڵەکان هەروەها لەکاتی بەستنەوەی ئەم ئامێرە بە کۆمپیوتەر دەتوانرێت (٣٥٢) ئامێـری کۆمپیوتــەر بەیــەک تەلەفـۆن ببەســترێتەوە ئەمەش بەتاکە ئامێـر دادەنرێت بۆ بەســتنەوەی بەکۆمەڵ و هەروەها تاکــە تەلەفۆنــە بــۆ راگرتنی تــۆری ئەنتەرنێت بەشــێوەیەکی یەکســـان بەهێزی11.802g هەروەها گواستنەوەی راگەیاندن و ئیمێل بەکێشـــی ٥٤ مێگابایت لەهەر چرکەیەکدا ئەمەش دەبێتە بەربەســتێک بۆ دزیکردن لەتۆری ئەنتەرنێت و لە ســیخوری . هەرەوەهــا بــۆ دام و دەزگاکان ســودێکی زۆری لێوەردەگرن لەبەر خێرایی تۆرەکــەو خێرایی تەلەفۆنەکان لەرێگای ADSL کێبـڵ هەروەهــا ســودی لــێ وەردەگیرێـت وەک تەلەفۆنێکی ئاســایی کەجۆرەکــەی (Gigaset SX550 dsl/cable) و وەک تەلەفۆنێک کەبتوانی لەگەڵ خۆتا هەڵی بگری هەروەها دەتوانی نامــەی پــێ بنێری تاژمــارەی نامەکە دەگاتە ٤٦٠ ووشــە هی هەروەها توانای ناردنی وێنەو مۆسیقاو چەند شتی تری هەیە..
بۆزانیاری زیاتر www.siemens-mobile.com




## کۆزیمۆ تۆشیبا

شەریکەی تۆشیبا دەڵێت دووئامێری لە بابەتە کانی کۆزیمۆ لەشــێوەی کۆمپیوتەری جانتا دەخەمە بازارەکانەوە کە تاکە ئامێربن لەبیستن و وەڵام دەرەوە و ژمێریاری کەتوانایەکی زۆربەرزیــان هەیە ئەمەش دەبێتــە ئامێری ماڵەوەو ئامێری تایبەتی کە کاردانەوەیەکی جوانی دەبێت و هەروەها توانای تۆمارکردنی ڤیدیۆ و دەنگی هەیە و هەروەها خێرایی کارکردن و ڕێک و پێکی ئامێرەکە دەبێتە هۆی ئەوەی کەلەیەک کاتدا چــوار فەرمانبەر دەتوانن کار لەســەر یــەک ئامێربکەن وە پێشــبینی دەکرێت هەریــەک لەئامێرەکانی کوزمیو إف ١٠» و«کوزمیو جی ١٠» لەســەر پێنتیــوم خێرایان بگاتە ٢ گێگا هیرتز لە انتل'هەروەها شاشــەی یەکەمیان قەبارەکەی٤،١٥ دەبێت ئەویتریان قەبارەی شاشــەکەی گەورەترە بەرێژەی ١٧ وە شاشەکانیشیان بریتین لە تروبایت هەروەها خیرایی وەک (سنتریو) واتا دوو بەقەدەر ئەو ژمارە کەدەنووسرێت ئەویش بری تییە لە ٨٠٢،١١ لە انتل دا PM 855 ە هەروەها لەکارە سەرکەوتوەکانی نیشاندانی سایدی ڤیدیۆیی بیستنی دەنگێکی ســادە بە کوالیتی **هارمون/کادون** بەشــێوەی **SRS** هەروەهــا فراوانی هاردی جی ١٠ بریتیــە لە ٢٠٠ گیگابایت و نرخە ٢٧٠٠ دۆلارە وە فراوانی هاردی ئیف ١٠ بریتیە لە ١٠٠ گیگابایت و نرخیشی بریتیە لە ١٧٠٠ دۆلار بۆ زانیاری زیاتر WWW.TOSHIBA-GULF.COM

## سوودێکی زۆرو نرخێکی کەم (میمۆری ستیک)

لــەســەر داواکــاریــەکــی زۆری بەکارهێنەرانی میمۆری لەبازارەکان شــەریکــەی ســوســری (سوییست) هــەستا بەخستنە بــازاری جۆرە مــیــمــۆریــەک کــی USB لــەگــەڵ بەستوە بەناوی میمۆری ستیک کە قەبارەیەکی بچووکی هەیە بــەڵام شت هەڵگرێکی زۆر بـاشـە وەک شــەریـکـەی سوییست خــۆی دەڵـێ بەکار هێنەرانی ئەم میمۆریە دەتوانن گرنتی ١٠ ساڵ لەگەڵ خۆیان ببەن بۆ ئـەم ئامێرە واتــا لــەســەر پــەڕی میمۆریەکە دژە ڤایرۆسێکی زۆر بەهێز دانراوە کە ڤایرۆس ناتوانێت کـاری تێبکات شەریکەی «بت فور




فلاش» (BIT4FLASH) بەدروست کردنی ئەم میمۆریە لەسەر سیمی « SLIM بەقەبارەی (٦٤) میگابایت و (١٢٨) مـیـگـابـایـت کـەتـوانـای گواستنەوەی ٧ میگابایتی هەیە لەهەر چرکەیەدا هەروەها بەکار هێنەران دەتوانن لەناو میمۆریەکە بۆ فۆڵدەرەکانیان ژمـارەی نهێنی دابنێن بە جۆری (SECUREB4F) هــەروەهــا کـێشـی فـلاشـەکـەش بریتیە لە ١٢ گرام وە نرخی ٦٤ میگابایتەکە بریتیە لە ٥،١٧ دۆلار و نرخی ١٢٨ میگابایتەکە بریتیە لە ٢٥ دۆلار بۆ زانیاری زیاتر .WWW SWISSBIT.COM

# مایکرۆسۆفت و ئامێرێکی نوێ بۆ بەستنەوەی تەلەفزیۆنەکان بە ئامێری کۆمپیوتەر



**ئا: ڕێباز ڕەواندزی**

کۆمپانیای مایکرۆسۆفت هەفتەی پێشوو هەواڵی بڵاوکردنەوەی ئامێرێکی نوێی پێشکەوتووی ڕاگەیاند کەتوانای بەستنەوەی تەلەفزیۆنەکان بەئامێری کۆمپیوتەر بەشێوەیەک کە تۆ بتوانی وێنەو دەنگ و پارچە ڤیدیۆ و ئیمێڵ بنێریت لەرێگەی ئەم ئامێرەوە بۆ شاشەی تەلەفزیۆن بەشێوەیەک وەک ناردنی (بلوتوپ) یان بە بەستنەوەی کێبڵ وە هەروەها پێشبینی دەکرێت نرخی ئەو ئامێرە بگاتە ۲۰۰ دۆلار و ئەم ئامیرەش ناوی (MSN TV2) لەخۆگرتووە ئەمەش بەدوا پێشکەوتن دادەنرێت لەم ئامێرە هەروەها ئەم ئامێرە ئاسانکارییەکی تری کردوە بۆخزمەت گوزاری زیاتر ئەمەش دانانی تۆری ئەنتەرنێتە لەناو ئەم ئامێرە بەشێوەیەک بێ ئەوەی تەلەفۆن بەکاربێنی هەروەها بەژداربوانی ئەم ئامێرەش مانگانە ۹،۹٥ دۆلاردەدنە بنکەی ئەم ئامێرە یاخود ساڵانە ۹۹ دۆلار ئێستا لە وڵاتە یەکگرتوەکان بەکاردەهێنرێت هەروەها چەند شەریکەیەک بەشداری لەدروستکردنی ئەم ئامێرە دەکەن وەک سۆنی و انتل و دێل و کۆمکاست و نیوز. هەروەها ئێستا شەریکەی مایکرۆسۆفت هەڵدەستێت بەدروستکردنی ئامێری جۆری (میدیا سەنتەر ئێکس تاندەر) کەتوانای بەستنەوەی تەلەفزیۆنە تایبەتیەکان بە کۆمپیوتەرە تایبەتیەکانی هەیە بەشێوەیەکی دیجیتاڵ واتا لەکاتی نیشادانی شەپۆلەکانی تەلەفزیۆن تۆ لەیەک شاشە چەند پارچەیەک بەیەکەوە نیشان دەدەیت بەژمارە واتا ئەگەر پارچە ڤیدیۆیەکت لەسەر ژمارە یەک دانابێت و هەروەها لەلایەکی تر ئیمێلەکەت لەسەر ژمارە دوو دانابێت دەتوانیت ژمارە یەک لێبدەیت پارچە ڤیدیۆکە کاربکات بەشێوەی دیجیتاڵ گرنگی ئەم ئامێرەش لەوەدایە کە بلوتوپ ی تێدایە وەک ئامێری مۆبایل دەتوانی شتی بۆبنێری و شتی لێوەرگری وە شەریکەی مایکرۆسۆفت کە سەرمایەداریەکەی ٦١ملیاردۆلارە دەڵی سادەیی ئەم ئامێرە دەبێتە حەسانەوەی ماندووبوانی پەخشی تەلەفزیۆنەکان هەروەها سام کلیبر لێپسراوێکی گەورەی شەریکەی مایکرۆسۆفت دەڵێ بەکارهێنانی تۆری پرۆباند لەداهاتو گرنگیەکی زۆر بەم ئامێرەدەدەن لەبەر ئەوەی هەر شتێک لەم تۆڕە ئاراستەی ئەم ئامێرە بکەیت ڕاستەو خۆ دەتوانیت بەخشی تەلەفزیۆنە تایبەتیەکانی بکەیت ئەمەش دیسان دەبێتە ئاسنکاری بۆ پەخش

* خدمة «لوس انجليس تايمز» (خاص بـ «الشرق الأوسط»)

# هاکرزێکی سعودی کەناڵی مستەقبەل و کەناڵی زین و بەرنامەی سوپر ستاری هاک کردوە




گەنجێکی سـعودی کـە نازنـاوی (CONIK) ە توانی لەمـاوەی ١٥ دەقیقەدا هەرسـێ ماڵپەر هاک بکات و بتوانێت تەواوی بەڕێوەبردنی ئەم سـێ ماڵپەرە بخاتـە ژێر دەسـتی خۆی بەتەواوی یوسـەرو پـاس وۆردەوە، لەم هاکەرەدا گەنجەکە هەڵسا بەسڕینەوەی لیستی هەموو ئەو کەسانەی بەشداریان کردبوو لە بەرنامەی سـوپر ستار کەلەسـەر کەناڵی ئاسمانی مستقبل پەخش دەکرێت بـووە هۆی سـڕینەوەی ناوی( ١٤٠٠٠) کـەس کە بۆ پاڵاوتن سـەردانی ئەم سایتەیان کردبوو، ئەوەی مایەی سەرسورمان بووە گەنجەکە تەمەنی ١٩ ساڵ بوە دانیشـتوی جـدە بووە دوای ئەوەی ئەم زانیاریانەیـان لەرێگای هۆتمەیل دۆزیتـەوە کە ئەم گەنجە ئیمێلەکەی لە نـاو ماڵپەری هۆتمەیلە، لەهەمان کاتدا لەبـەر ئەوەی هەرسـێ ماڵپەر لەسـەر یەک سێرڤەر بوونە بۆیـە توانیوەتی هەرسـێکیان هاک بکات ئەمە جگە لەوەی کە هەرسـێ ماڵپەر هەمان وشـەی تێپەربویـان هەبـوە، بەڵام لەبەر ئـەوەی توانیویانە زوو بـەم هاکە بزانن وە گەنجەکەش پاس وۆردەکەی نەگۆری بوو بەشـێک لە فایلەکان بگەڕێنەوە بۆ ئەم زنجیرەی بەرنامەی سوپر ستاریش بە تەخمین براوە دەست نیشان بکەن، لاوەکە لەشـوێنی لاپەرەکاندا فەرمودەیەکی پێغەمبەر (د. خ ) لەسـەبێ دانابوو وە ئەوەشی باس کرد کە لە ماوەی یەکەم کاتژمێری هاک کردندا زیاتر لە ٢٥٠ نامەی پیرۆزبایی و دەست خۆشی بۆ هاتووە .

# چۆن میمۆری کارت فۆرمات دەکەیت

هێدی کامران

دوای زیاد بونی خزمەت گوزاریەکانی مۆبایـل وەکـو خەزنکردنـی مەلەفاتـی وێنەیـی و ڤیدیۆیی، میمۆری کارتیش بۆ مۆبایـل زیـاد بوو بۆ زیاتـر خەزنکردن و هەلگرتنـی ئـەم فایلانـە زۆر جار ئەم میمۆریـە پردەبێـت یـان تـەواوی ئـەم فایلانەت خسـتونە سەر کۆمپیوتەر بۆیە بـۆ دوبارە خەزنکردنـی چەند وێنەیەکی تر پێویسـتە میمۆری کارت بەتاڵ بکەیت یـان فۆرماتی بکەیت بۆ ئـەم کردارەش ئەم هەنگاوانە پەیرەو بکە

لەسـەرەتادا EXTRAS هەڵدەبژێریـت دواتر MEMORY هەڵدەبدێریت لەپاشـان OPTIONS هەڵدەبژێریـن ئینجا FORMAT MEM. CARD هەڵدەبژێریـن لـە کۆتاییدا YES دەکەین بەمەش میمۆری کارتەکەت وەک شێوەی تازە لێدێت کە کری بووت هیـچ لـەو زانیاریانـی تێـدا نامێنێت کە لەپێشدا خەزنت کردبون .



# شەریکەکی جیهانی ئامێری ڤیدیۆ لینک بۆ عێراق دەبەستێت video conferencing

ئا: نەسرین عبدالقادر

**لندن: «الشرق الأوسط»**

زۆربەی زۆری بنکە عیراقیەکان سوود لـەم کارە وەردەگـرن و هـەروەهـا لقی سـەرەکی و ناوەکی لەدەرەوەی وولات و لەناوەوەی وولات دادەمەزرێت سوود وەرگرەکانیش بریتین لە بنکەی نەوتەکان و بنکـەی کیریتـەکان و سـەرجەم ئـەو بنکانەی کە ئاڵـوو گۆڕ لەگەڵ دەرەوەی وولات دەکـەن و ئاڵوو گۆڕەکانیشـیان بریتیـن لـەو شـتانەی کـە داواکاریمان زۆرەو زۆریـش داوادەکرێـن بنکـەی سـەرەکی ئـەم ئامێـرەش لـە کویتە بۆ ئەمەش ئاوو هـەوای عیراق و هەروەها جوگرافیای ئەم وولاتەیان بە لەبار زانی بۆ ئەم مەبەستەش شەریکەی (تانبێرگ) TANBERG ئیمزا گەلێکیان بەسـت لەگەڵ **(عبـد العزیـز الغربللی)** کـە بەرێوبەری گشـتی بازارە لەعێراق بۆ بەسـتنی ئەم ئامێرە پێشـکەوتوە ئەم ئامێرەش بریتیە بەبەستنەوەی ڤیدیۆیی راستەو خۆ لەگەڵ ئەو شوێنانەی کە کاریان لەگەڵ دەکرێت و وە گواستنەوەی وێنەیەکی سەرکەوتوو بـێ ئـەوەی پچـران هەبێت لـەم هێلە و هەروەها ئامێرە لاسـلکیەکانیش ناتوانن ئالـۆزی بخەنە سـەر ئـەم ئامێـرە بەم جۆرە سـەرجەم دام و دەزگاکانی وەک زانکـۆکان و بنکە بزیشـکیەکان و دەزگا پۆلیسیەکان سوود لەم ئامێرە وەردەگرن سایتی ئەم شەریکەیەش لەعێراق بریتیە لە (WWW.TANDBERG.NET) هەروەها لە هەمـوو جیهانیش سـایتەکەی بە WWW. ALALAMIAH.COM، ناسـراوە هەروەهـا ئێستا لە عیراق ئەم کارگەیە کاری خۆی ئەنجام دەدات ئامێرەکەش ناوی VIDEO CONFERENCING، لەخۆ گرتوە.

# کۆمپیوتەری باغەڵ و بە خاسیتی (وای فای)

ئا: مەجید شکر

بـەم دواییـە ئامێـری ئـای میـت PDA2K کـە شـەریکەی (کاریر دیفایسر) دەری دەکات کەوتە بازارەکانی (دبـی) هەروەها کیبۆردەکەی بریتیە لـە جـۆری (QWERTY) وە دوگمەکانـی بریتین لـە ٣٩ دووگمە کە کیبۆردەکـەی بەرەو دواوە دەشـکێتەوە ئەمـەش بـۆ بچوکـی ئامێرەکەو هەروەها بۆ کارئاسانی بەکارهێنەرەکانی ئەم ئامێرە بەڵام خاسیتێکی گرنگە ئەم ئامێرە ئەوە کەدەتوانی لەهەمان کاتدا لەگەڵ لاسلکیەکان پەیوەنـدی بکـەی بـە جـۆری وای فـای 802.11B کارەکانـی ئەنجام دەدا بەخێرایی ٤٠٠ میـگا هیرتز هەروەها هەردوو تۆری GSM/GPRS ی تێدایە بۆ پەیوەندی کردنو بۆ داخـڵ بوون لەگەڵ ئەنتـەر نێت بەم



جۆرە وەک مۆبایلێکی باغەڵ و هەروەها وەک کۆمپیوتەرێکـی بچووکی ناوباغەڵ بەکاردێـت هەروەها بەرنامـەی ویندۆز ٢٠٠٣ دەچێتە سـەر و هەردوو نێردراوو هێنەری بلووتـوپ ئیفرارێتی تێدایەو MSN و میدیـا پلەیەر و انترنێت ئێکس پلورەر ی لەخۆ گرتوە توانای نیشاندانی ڤیدیۆیی هەیە کەجۆرەکەی بریتیە لە VGA قەبارەی شاشەی (٣،٥ )ە هەروەهـا جۆری دەنگەکانیش بریتین لە MP3 و قەبارەی هاردەکەشی ١٢٨ میگابایتە هەروەها شوێنی میمۆری هەیە میمۆری جۆری SD/MMC دەخوات بۆ زانیاری زیاتر لەخۆگرتن WWW.CARRIERDEVICES.COM




ئا: روزا عبدالخالق

بۆ پاریزگاریکردن لە ڤایرۆس و هاکەرزو چەتەو هەرەشــە نهێنیــەکان تــا دێــت لەگەڵ پێشــکەوتن و ئەم هەمــوو گۆرانە خێــراو بنەرەتی و داهێنەرانە لەبــواری ئەنتەرنێت دا لەهەمان کاتــدا دزو چەتەو ڕێگریش لەناو تۆرەکانی ئەنتەرنێت زیادیان کــردوە خۆپاریــزی و پاریزگاریکردنــی کۆمپیوتەرەکەت لەم چەتەو ڕێگرانە ماندوو بون و هەولێکی جدی دەوێت . لەســەر ئەم ئەساســە چەندان بەرنامەی جۆراو جۆر دروســت کراون و داهێنــراون، وەکــو (PANDA) (AVG) هتــد بــەلام لەهەمویان بەهێزتــر بەرنامــەی NORTON INTERNET SECURITY 2005 REATAIL کــە دەتوانێــت جگــە دژە ڤایــرۆس ئەتوانێت کاری چەنــد بەرنامــەی تریــش بگرێتەوە کــە بریتین لــە بەرنامەی (NORTON ANTIVIRUS) بەرنامــەی پارێــزەری کەســی یــان دیــواری ئاگریــن کــە بەهێزتریــن پارێــزەرەو (NORTON™ PERSONAL FIREWALL) بەرنامــەی کونترۆلــی نهێنــی (NORTON™ PRIVACY CONTROL) بەرنامەیــەک بــۆ ڕێگــە گرتــن لــە ماڵپــەرە نەگونجــاوەکان (NORTON™ PARENTAL CONTROL) دەتوانێــت ئەم بەرنامەیە لەڕێگای ئەم ماڵپەرە یان لینکــەوە دابەزێنیت بــۆ ناو کۆمپیوتەرەکــەت (HTTP://WWW.SYMANTEC.COM/PRODUCT/) دوایی دایمەزرێنیت و بتوانیت لەرێگایەوە پاریزگاری لە کۆمپیوتەرەکەت بکەیت بەلام بۆ ئەو کۆمپیوتەرانەی لەگەڵ ئەنتەرنێت نەبەســتراون تەنها ســود لە دژە ڤایرۆســەکەی دەبینیت . ژمارە (١) وێنەی ماڵپەرەکەیە کە تایبەتە بەم بەرنامەیەو چەندان بەرنامەو ڤێرژنی نوی و ٢٠٠٦ گەیشــتون تەنانەت بۆ مۆبایلەکانیــش هەمان خزمەت گوزاری پێشکەش دەکات .

# جۆرەکانی پرێنتەرو جیاوازییان



**کامەران خۆشناو**
kameran7605@yahoo.com

پرێنتەر:- ئامێرێکە بۆ چاپ کردنی نووسین و وێنە، واتە گۆرینی زانیارییەکان لە شاشەوە بۆ سەر لاپەڕە.

### فۆنتە جێگیرەکانی پرێنتەر

بریتین لەو فۆنتانەی کەهەن لەناو پرێنتەر، وە چاپ کردن لە ڕێی ئەم فۆنتانەوە زۆر خێرایە .

### جۆرەکانی فۆنتە جێگیرەکان

١.فۆنتی تروتایپ / دەتوانرێ بەدیاربخرێ لە ڕێگای چەند هاوکێشەیەکی بیرکاری، وە دەتوانین قەبارەی فۆنتەکە بگۆڕین بێ ئەوەی کار لە تێکچوونی پیتەکە بکات، وە چاپ کردنی بەو شێوەیەی کە لەسەر شاشەکە دیارە .

٢.فۆنتی بەخاڵ/ ئەمەیان هەڵدەسێ بە خەزن کردنی هەر پیتێک بە شێوەی چەندین خاڵ، بەلام لەکاتی گۆڕینی قەبارەی فۆنتەکە دەبێتە هۆی شێواندنی شێوەی پیتەکە.

### خەزن کردنی کاتی

بەرنامەیەکە لەسەر ئامێری کۆمپیوتەر کە هەڵدەستێ بە پاراستنی زانیارییەکانی پێویست بۆ چاپ کردن، کە دەبێتە هۆی ئەوەی کە کار بە ئامێرەکە بکرێت بێ ئەوەی چاوەڕوانی کاری چاپەکە بکەین.

### زاکیرەی یارمەتیدەر

بەشێکە لە زاکیرەی ناو پرێنتەرەکە، کە هەڵدەستێ بە خەزن کردنی زانیاری پێویست بۆ چاپ کردن، وە لەکاتی پڕبوونیدا پێویستە لە سەر ئامێرەکە چاوەڕوان بێت، پێش ئەوەی زانیاری تر ڕەوانە بکات .

### گرنگترین پێوانەکانی پرێنتەر

خێرایی پرێنتەر پێوانە دەکرێت بە چاپ کردنی پیتێک لە یەک دەقیقە، یاخود یەک





لاپەڕە لە دەقیقەیەکدا، وە هەروەها پلەی ڕوونی پرینتەر پێوانە دەکرێت بە بوونی چەندین خاڵ لەیەک (بوصە)دا، واتە پلەی ڕوونی زۆر بێت ئەوا وێنەکە ڕوونتر دەردەکەوێت .

## گرنگترین جۆرەکانی پرینتەر

### پرینتەری لێزەری:

شێوەی بەکارهێنانی وەکو ئامێری وێنە گرتنە، پێکهاتووە لەسەرێکی چاپکەر، کە هەڵدەستێ بە پرژینی مەرەکەبەکە بۆ سەر لاپەڕە لە ڕێگای چەندین کونی بچووکەوە، خێراییەکەی بریتییە لە چاپ کردنی ٤ تا ٢٠ لاپەڕە لە دەقیقەیەکدا، ئەمیش ئەوەستێ لەسەر یەکەی چارەسەری ناوەندی لەناو پرینتەرەکە، وە پلەی ڕوونی بریتییە لە ٣٠٠ خاڵ تا ١٢٠٠ خاڵ لەیەک ( بوصە)دا، یان ١٨٠ تا ٧٢٠ خاڵ لە بوصەیەکدا، وە ئەم لاپەڕانە وەردەگرێت بە پێوانی ٨،٥*١١ بوصە، زەرفی نامە، لاپەڕەی ڕوون، ناونیشان، وە مەرەکەبێکی ڕوونی نەرم بەکاردێنێ (تونەر)، وە چوار ڕەنگە سەرەکیەکە بەکاردەهێنێ کە بریتین لە سوورو شین و زەردو ڕەش، واتە چەند ڕەنگە سەرەکیەکە زیاد بکەین ئەوا وێنەکان جوانتر و ڕەونەق تر دەردەچن .

### زمانەکانی پرینتەری لێزەری

١. زمانی PCL : = کە کورتکراوەی وشەی (PRINTERS CONTROL LANGUAGE)، کە دروستکراوی کۆمپانیای (هیولیت باکارد) ە (HP)، کە بەکاردەهێنرێ لەگەڵ پرینتەری لێزەری.

٢. زمانی ( POST SCRIPT ) := هاوکاری پرینتەر دەکات بۆ چاپ کردنی ئەو شتانەی کە زۆر وورددن، کە پێویستیان بە چەندین ڕەنگ و وێنەو جۆرەکانی فۆنتە، لەبەرئەوە ئەو پرینتەرانەی ئەم جۆرە زمانە بەکاردەهێنن گرانن لە نرخدا.

### زاکیرەی پرینتەری لێزەری

بوونی زاکیرە لە پرینتەری لێزەری زۆر پێویستە کە ئەمیش لە نێوان ٤ تا ٨ میگا بایتە .

### پرینتەری خاڵڕێژ (Dot Matrix)

ئەم جۆرە پرینتەرە نرخەکەی هەرزانە، وە ژاوەژاوی زۆرە، چەند ددانێک بەکاردەهێنێ لەسەر لیستی مەرەکەبەکە بۆ چاپ کردنی وێنە .

### پرینتەری پەیوەست بە بازنەیەکی خولاو (Daisy wheel)

بە شێوەیەکی بەردەوام ژاوەژاوی هەیە، کارکردنەکەی وەکو کاری چاپی دەستە، هەتا شێوەی پیتەکانیشی .

### پرینتەری مەرەکەبی ڕەق

ئەم جۆرەیان وێنەیەکی پلە ڕوون دەردەکات، وە نرخەکەی تا رادەیەک هەرزانە، وە پرینتەرێکی نموونەییە بۆ چاپ کردنی وێنەی ڕەنگاوڕەنگ لەسەر لاپەڕەی ڕوون .

### پرینتەری پلە بەرزی ڕەنگ

ئەم جۆرەیان گرانترین جۆری پرینتەرە، وە وێنە واچاپ دەکات لە شێوەی وێنەی فۆتۆگراف.

### پرینتەری چەندین کار

ئەم پرینتەرە ئەتوانرێ بەکاربهێنرێ وەکو ئامێری فاکس یاخود سکانەر یان کۆپی کردنی لاپەڕە، لەتەک کاری چاپ کردن وەکو پرینتەرێکی ڕەنگاو ڕەنگ.









# چی بکەین ئەو کاتانەی کەلەکۆمپیوتەر بێزار دەبین؟

ئا: سمیر نورالدین

خۆشەویستان زۆر بەی ئەوکەسانەی کەکار لەسەر کۆمپیتەر دەکەن زیاتر لە شەش کات ژمێر کاری کۆمپیتەر دەکەن زۆر جاری واهەیە کەلەکۆمپیتەر بێزار دەبن، وە زۆری کار کردن لەسەر کۆمپیتەر وا دەکات کە کەسەکە توشی ماندوویی بێت یاخود ژانە سەر بێت وەیان زۆر بێزار بێت کەنەتوانێت کارەکانی خۆی بەباشی بەرێوە ببات،

بۆیە واباشە کە کەمێک مێشکی بحەسێنێتەوە، بۆ ئامۆژگاری بۆ ئەوکەسانەی کەتوشی ئەم کێشەیە دەبین واباشە کەچەند یاریەکی کۆمپیتەر بەکار بیهێنن، ئەو یاریانەش کە وادەکات کەسە مێشکی بحەسێتەوە وە وابکات دووبارە حەزی بچێتەوە کارەکەی . ئەم یاریانە تەنها بۆ زاخاوی مێشک بەکاردێت یاریەکان زۆرن ئێمە لێرەدا نامانەوێت هەموویان باس بکەین وەنامانەوێ خەلکان بەس یاری کۆمپیتەری ئەنجام بدەن تەنها بۆئەوکاتانەیە کە کەلەکاری کۆمپیتەرەکە بێزار و ماندوون .

# یاری Motor Race




وێنەی (١)

ئا: هاوکار ڕەحمان

یـاری MOTOR RACE یارێکـی زۆر بەچێـژە خـۆم یەکێکم لەوانەی کەزۆر حەز لەو یاریە دەکەم زۆرجار لەکاتی یاریکردن حەزدەکەم پلە یەک بەدەست بێنم بەڵام خۆشیو چێژی یاریەکە ناهێڵیت ئەو یاریە لەسەر کۆمپیوتەرکاردەکات بەهۆی کیبۆرد وەیاخـود دەتوانـی بەبەکار هێنانی دەسـکی یـاری کەلەگەڵ کۆمپیوتەر دەبەسترێت لەجیاتی کیبۆرد بەکاری بێنی

سـەرەتا دێیـت یاریەکـە دادەبەزێنیـت لەسـەر ئامێـری کۆمپیوتـەر ئینجـا یاریەکەدەکەیتـەوە پاشـان لیسـتێک دێت یەکەمیان هەڵدەبژێریت کە SOLO یە پاشـان لیسـتێکی تردێت کە سـێ بەشـە هەرکامەیان هەڵبژێریت دەتوانیت یاریە بکەیت بەم شـێوەیە (وێنـەی ٢) پاشان لیستێکی تردێت کە ماتۆرەکە لەناوەراستە و هەروەها لەلای ڕاست و لەلای چەپی ماتۆرەکەش دوو ئاراسـتەی زەرد هەیـە دەتوانیـت بەهـۆی گۆرینـی ئەو ئاراسـتانەوە شـوێنی یاریەکە بگۆڕێت واتا لەسەر بەفر یاری دەکەیت یاخود لەسەر خۆڵ یاخود لەسەر جادە بەکەیفی خۆت یـاری دەکەیت هەر لەخـوارەوەی ئەمانەش CONTINUE هەیە کلیکی لەسـەردەکەین بەم شـێوەیە (وێنـەی ٣) ئینجا لیستێکی تردێـت لەوێوە START هەیە بەماوس کلیکێکی لەسـەردەکەین دەبینین ڕاسـتەوخۆ یاریەکە دێت پاشان بەهۆی کیبۆردەکە بە UP بەرەو پێشـەوە دەروات DOWN ئیستاپ دەکا LEFT بۆلای ڕاست و RIHT بۆلای چەپ دەروات هەروەها SPAEC بۆ پێش بڵندکردنـی ماتۆرەکـەو بۆخێراکردن بەکاردێت بەم شـێوەیە ماتۆرەکان پێنجار لەسـەر یەک بەشوێنی جۆراو جۆر خولەک دەخۆنـەوە ئینجـا یـاری تـەواو دەبێت مەرجی ئـەو یاریەش خێراییە واتا تۆ دەبێ زۆر خێرابیت و هەوڵبدەیت بەهیچ لایەک نەکەویـت ئینجا تۆ پلە یەک بەدەسـت دێنیت و جامی جیهانی بەدەست دێنیت.




وێنەی (٢)




وێنەی (٣)

# کۆمپانیای ئەدۆبی لە هەنگاوی کۆتاییدایە بۆ کڕینی کۆمپانیای یولید




کۆمپانیای ادۆبی کە کۆمپانیایەکی بەهێزە لە بواری بەرهەم هێنانی سۆفتوێر واتا بەرنامە و تا ئێستا باشترین بەرنامەکانی دەستکاری کردنی وێنەی بەرهەم هێناوە وەکوو بەرنامەی (ئەدۆبی فۆتۆ شۆپ ) و هەروەها باشترین بەرنامەی خوێنەری کتێبە ئەلکترۆنیەکانی بەرهەم هێناوە کە بەرنامەی (ئەدۆبی اکرۆبات ریدەر و رایتەر) ە و هەروەها بەرنامەی بە هێزی بواری مۆنتاژ و دۆبلاژ کە بەرنامەی (ئەدۆبی بریمر) ە و چەندین بەرنامەی بەهێزی تری بەرهەم هێناوە ئێستا لە هەنگاوەکانی کۆتایی گرێ بەستێکە بۆ کڕینی کۆمپانیای مایکرۆمیدیا کە ئەو کۆمپانیایەش بەهێزە لە ڕووی بەرهەم هێنانی بەرنامەکانی بواری دیزاین و نەخشە سازی وەکوو بەرنامەکانی (مایکرۆمیدیا فلاش و مایکرۆمیدیا دریم وایڤەر و چەندین بەرنامەی تری بەسوود) ە

## کۆمپانیای (Imlogic) هۆشداری لەسەر جۆرە ڤایرۆسێکی ترسناک بڵاو دەکاتەوە

کۆمپانیای (IMLOGIC) بەکارهێنەرانی سایتەکانی ئەنتەرنێت ئاگادار دەکاتەوە لە جۆرە ڤایرۆسێکی نوێ بە ناوی کرمی قسەکەر واتا ئەو جۆرە ڤایرۆسە زۆر زیرەکانە ئامادە کراوە کە لە توانای دا هەیە لە کاتی چات کردندا بچێتە ژوورەکانی گفتوگۆ کردن تاکوو بتوانی زۆرترین کەس ڕابکێشێت بۆ لای خۆی تا ئامێرەکانیان تووشی ڤایرۆس بکات و ئەو جۆرە ڤایرۆسە ئەم چەند ووشەیە دووبارە دەکاتەوە بە زمانی ئنگلیزی دەڵێت (ئەم سایتە زۆر جوان و باشە وەرە ئەم سایتە بکەرەوە ) تاکوو ئەو کەسەی کە گوێی لەو ووشەیە بێت ئەو سایتە بکاتەوە و تووشی ڤایرۆسەکە بێت